# کاروان

گۆڤارێکی ڕۆشنبیریی مانگانەیە
ئەمیندارێتیی گشتیی ڕۆشنبیریو لاوان
بەزمانی کوردیو عەرەبی دەری دەکا

ژمارە 13 تشرینی یەکەمی / 1983



## لەم ژمارەیەدا

| | | |
|---|---|---|
| * زمانەوانی | د . ابراهیم عزیز ابراهیم ، عبدالستار کاظم ، بائیز عمر احمد .. | 2 |
| * لێکۆڵینەوە | ئومێد ئاشنا ، وصفي حسن ردێنی ، صدیق شرو مزوري ، ابراهیم احمد شوان . | 24 |
| * دیوانی کاروان | عبدالله طاهر عمر ، لەتیف هەڵەت ، ملا مسعود (بێبەش) ، نجم الدین ملا ، حەمەی حاجی عەبدوللا ، ڕۆستەم باجەلان ، کاکەی فەللاح ، فەرەیدون عەبدول بەرزنجی .... | 37 |
| * جیهانی چیرۆک | عەبدللا سەراج ، خالد صالح حسن ، صلاح الدین صالح مجید ، زایەر عبدالله ، غریب پشدەری ، د . هیوا عمر احمد . | 44 |
| * شانۆ | عبدالله محمد عبدالله ، دلاوەر قەرداخی .. | 66 |
| * هونەر | وریا ئەحمەد .. | 74 |
| * فۆلکلۆر | محمد عبدالله ، حبیب سعید محمد ، کمال احمد دۆڵپە موویی ، نزار محمد سعید . | 76 |
| * پەروەردەو منداڵ | جلال خلف ژالەیی ، بنیامین یوخنا دانیال | 85 |
| * بەرهەمی لاوان | جلال حمد امین ، سامان عبدالقادر دزەیی ، نەوزاد عەلی ، عمر فارس محمد ، قەهار گەردی ، رفعت عمر پیربال ، مدیحە صابر صوفي .. | 90 |
| * شانۆگەری ژمارە | مەجید ئاسنگەر . | 94 |
| * کاروانی ڕۆشنبیری | شوان ، ئاسۆس ، مەتین . | 104 |

ئەدرەس : هەولێر ـ ئەمیندارێتی گشتی ی ڕۆشنبیریو لاوان ـ گۆڤاری (کاروان) ـ ص : 20002

# هەندێ بابەت لە سینتاکسی زمانی کوردیدا

نووسینی

دکتور ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم
کۆلیجی ئەدەبیات ـ زانکۆی سەلاحەدین

## پێشەکی

سینتاکسی مەیدانی فرەوانە لە ڕێزمان و زمانی کوردیدا. هەروا دەورێکی گرنگی هەیە. ئەم بابەتە لە زمانی کوردیدا زۆر کەم باس کراوە. باسکردنەکەش بە شێوەیەکی تایبەتی نەکراوە. بەڵکو لەناو قەوارەی کتێبی تێکڕای ڕێزمانی کوردی کراوە. زۆر پێویستە سینتاکسی کوردی ببێتە باسێکی سەربەخۆ ووتارو کتێبی لەسەر بنووسرێن.

بێگومان نووسینی ئەم باس و ووتارو کتێبانە لە سینتاکسی کوردیدا ئەرکی تاقە کەس نییە. بەڵکو دەبێ پسپۆری تایبەتی هەبێ یان ئەوانەی ڕێزمانی کوردی دەنووسن بایەخێکی باشتر بەم بابەتە بدەن، چونکە سینتاکس گیانی زمان و ڕیزمانە. تا ئەم گیانە زیندوو بێ زمان و ڕێزمان هەر زیندوو دەبێت وبەزیندوویی دەمینێتەوە. بۆ ئەوە من بەش بە حاڵی خۆم هەندێ هەوڵ و تەقەلام داوە بۆ نووسینی شت لەسەر سینتێکسی کوردی. وا لێرەشدا هەندێ بابەت لە سیناکسی

کوردی پێشکەش بە خوێندەوارانی کوردی دەکەمو لە گۆڤاری تەریزی کارواندا بڵاوی دەکەمەوە . ئەم وتارەم ئەم بابەتـانە پێشکەش دەکاتو باس دەکات :

**1 — ڕستە**
**2 — ڕستەی یەك بناغەیی**
**3 — ڕستەی دوو بناغەیی**
**4 — ناوەڕۆکی ڕستە یان بەشەکانی ڕستە**
**5 — بکەر**
**6 — فرمان ـ گوزارە**
**7 — بەرکار**
**8 — دیارخەر**
**9 — ئاوەڵکار**
**10 — بینای بەرکار**
**11 — جیاوازی نێوان بینای بکەرو بینای بەرکار .**

## ڕستە

ڕستە : کۆمـەڵە ووشەیـەکە کـە پێکەوە بـەبستراونـەتەوە لە قەوارەیەکی تایبەتیو واتایەکی دەبەخشێ .
مەرج نییە هەموو ڕستەیەك ، ئەم بەشانەی خوارەوەی تیابێ زۆر جـار یەکێکیـانی تیا نییـە 1 — تەواوکـەر 2 — دیارخـەر 3 — فرمان 4 — بکەر .
دەتوانین ئەم پێناسەیە بـەسەر ڕستـەیەکی سـادەی کوردی بسەپێنین تا بۆمان دەرکەوێ بۆ نموونە : ـ

( ئازاد چوو بۆ بازاڕ )

ئەم ڕستە سادەیە لە چوار ووشە پێکهاتووە هەموویان لە قەوارەی ڕستەکـەوە پێکەوە بـەسترانـەتەوە هـەروەك دیارە ووشەی (ئازاد) بەووشەی (چوو) بەسـتـراوەتەوەو ووشـەی (چوو) بە ئامرازی (بۆ) بەستراوەتەوە ئامرازی (بۆ) بە ووشەی (بازاڕ) بەستراوەتەوە ئـەم پێکەوە بـەستنەوەی ووشـەکانی ڕستە پێکەوە بەستنەوەیەکی (لفظیـە) چونکـە لە نێوانیـاندا ئامرازی تایبەتی نییە . ڕستە بە پێی ئەم پێناسەی سەرەوە پێکهاتووە لەپێنج بەش :
1 — بکەر .
2 — فرمان .
3 — بەرکار .
4 — دیارخەر
5 — ئاوەڵکار .

لەڕووی ناوەڕۆکەوە ڕستە ئەکرێ بەدوو بەشەوە :

**1 — ڕستەی یەك بناغەیی .**
**2 — ڕستەی دوو بناغەیی .**

1 — لە زمـانی کوردیـدا ڕستەی یـەك بنـاغـەیی شتێکی زۆر ئاشکرایەو بەشی زۆری ئەم جۆرە ڕستەیە لە گـوزارە یان فرمان پێکدێت بۆ نموونە : ـ
( ئاشکرایە) لێرەدا ئەم دەربڕینە (ئاشکرایە) ڕستەیەکە دەلالەتی وەڵامدانـەوە پیشان دەدات یـان دەلالەتی هـەواڵ گوتنێ نیشان دەدات ئەم ڕستەیە لەدوو ووشە پێکهاتووە (هەرا + ە ) وەهەروەها نموونەیەکی تریشی هەیە (دیـارە) ئەویش پێکهاتووە لە ( دیار + ە ) بەپێی ئەمە دەتوانین جۆرەهـا ڕستەی یەك بنـاغەیی دروست کـەین . لەسەرەوەدا بـۆمان دەردەکـەوێ کە دەستـووری ڕستەی یـەك بنـاغـەیی بـەم شێوەیەی خوارەوەیە :

ناو + ە ئاوەڵناو + ە
دیار + ە خۆش + ە
(دیارە) بە ئاوەڵناویش دێ .
( خۆشە ـ پاکە ـ جوانە ) ڕستەی وەڵامدانەوەن .
( هەرایە) (ایە) (دیفتۆنگە) .
دیفتۆنگ : پێکهاتووە لە دوو پیتی بزوێن یان زیاتر بەدوای یەکا لە ووشەیەکدا .

2 — ڕستەی دوو بناغەیی :

أ ـ هاتوچۆ کردن          قەدەغەیە .

نیهاد          گوزارە

ب ـ ئازاد          دەنوسێ

بکەر          فرمان

ڕستەی دوو بناغەیی : ئەوەیە کە پێکهاتووە لە دووبەش یان زیاتر بۆ نموونە : ـ

أ ـ ئازاد دەنوسێ .

ب ـ ئازاد چاپوکە .

لێرەدا دیارە کە ووشەی ئازاد ... لە ڕستەی یەکەمدا (بکەرە) چونکە بە ئیشی نووسین هەڵساوە یان ئیشی نووسین دەکات . لە ڕستەی دووەمدا ووشەی (ئازاد) کە ناوێکی تایبەتی یە بوە بە نیهاد چونکە ووشەی زیرەکە ، ئازادی ڕوون کردۆتەوە .

بەشەکانی ڕستە :

١ ـ بکەر : ووشەیەکە کە بە ئیشێکی تایبەتی هەڵدەستێ وە ڕەواڵەتی ئیشەکەی تێدا دیارە بۆ نموونە : ڕزگار نامە دەخوێنێتەوە .

کاوە کار دەکات .

لە ڕستەکانی سەرەوەدا ( ڕزگار ، کاوە ) ئەمانە ناوی تایبەتین لە ئاستی خۆیدا بکەرن لەناو ڕستەدا . وەنەبێ لە زمانی کوردیدا هەر تەنها ناوی تایبەتی ببێ بە بکەر بەڵکو جۆرەها ووشە ناو یان هەر شتێکیتر دەتوانێ ببێ بە بکەر :

أ ـ قوتابی سەر ئەکەوێ .

ب ـ گەل خەبات دەکات .

ح ـ سەربازەکان دەجەنگن .

د ـ جوتیار زەوی دەکێڵێ .

لە ڕستەکانی سەرەوەدا دیارە ناوی گشتی بووە بە بکەر لەڕستەدا ، هەروا ڕاناویش بە هەموو جۆرەکانیەوە دەتوانێ ببێ بە بکەر .

أ ـ تۆ چیرۆک دەخوێنیتەوە .

ب ـ ئەو ئەفسانەی چیای ئاگرین دەخوێنێتەوە .

ح ـ ئێمە لە زانستگا دەخوێنین .

بکەر دەتوانێ ڕاناوی نیشاندان بێت وەك ( ئەوە بۆ دوور ـ ئەمە بۆ نزیك ـ ئەوانە ـ ئەمانە ) ئەوە کوردە . ئەوە قوتابیە .

لەم نموونانەی سەرەوەدا دیارە کە (ئەوە) نیهادە ، گوزارەکەی ووشەی (کوردە) کە لە دوو بەش پێك هاتووە (کورد + ە ) لەزمانی کوردیدا ئەم جۆرە ڕستەیە زۆر بەرچاو دەکەوێت وەك :

(ئەوەهات)

بکەرە چونکە بە ووشەی (هات) دەست نیشان کراوە .

( ئەوە ئازادە نووستوە )

( دوو گوزارەی هەیە (نووستوە) فرمانە .

لە زمانی کوردیدا ئەم جۆرە فۆرمە زۆر بەرچاو دەکەوێ :

ئەوە ڕۆیی

ئەو هەڵواسرا

ئەوە پێ دەکەنێ

بکەر لە زمانی کوردیدا دەتوانێ ڕاناوی نیشاندان ( ئەوانە بێت ) بۆ نموونە :

ئەوانە          هاتن

بکەر          فرمان (ن) ـ کۆ

ئەوە          قوتابیە

نیهاد          گوزارە ـ بۆ تاك

ئەوە          هات

بکەر          فرمان ـ تاك

بکەر دەتوانێ ڕاناوی نیشاندانی بۆ نزیك وەکو (ئەمە) بۆ نموونە :

ئەمە          خوێندکارە

ن .          گ .

ئەمە دەخوێنێ

ب . ف .

لە ڕستەکانی سەرەوەدا ( ڕستەی دووەم بکەرە ) بەڵام ڕستەی یەکەم نیهادە ڕاناوی نیشاندان (ئەمە) توانیویەتی ببێ بە نیهاد یا بکەر لە ڕستەدا . هەروا ڕاناوی نیشاندان ئەمانە) ئەویش دەتوانێ ببێ بە نیهاد یان بکەر بۆ نموونە :

**ئەمانە شۆڕشگێڕن . ئەمانە خەبات دەکەن .**

**بکەر لەزمانی کوردیدا دەتوانێ خۆی لەگەڵ فرمان ڕێك بخات لەڕووی تاك و كۆ بۆ نموونە : ـ ئەوە چوو .**

**لێرەدا (ئەوە) ڕاناوی نیشاندانی تاکە خۆی لەگەڵ فرمان (چوو) ڕێکخستوەو هەردوکیان تاکن هەروەها لەڕووی کۆوەش دەتوانن خۆی لەگەڵ یەك بگونجێنن بۆ نموونە :**

**(ئەوانە چوون) بکەرو فرمان دەلالەت لەسەر کۆ ئەکەن . وەنەبێ هەر بکەرو فرمان لەگەڵ یەك بگونجێنن ، بەڵکو نیهادو گوزارەش دەتوانن خۆیان لەگەڵ یەك بگونجێنن بۆ نموونە :**

**ئەوە زیرەکە**
**ئەوانە زیرەکن | تاك ـ کۆ**

**بکەر دەبێ لە دوو وشە یان زیاتر پێك هاتبێ لێرەدا بکەرەکە بە یارمەتی ئامرازی (و) ی پەیوەستدار هەردوو وشەکان پێك دەبەستێتەوە بۆ نموونە : ئازادو نەوزاد هاتنە ئێرە .**

**لێرەدا وشەی (ئازاد) بە وشەی (نەوزاد) بەستراوەتەوە بە یارمەتی ئامرازی (و) بە یەکەوە بەستراونەتەوە هەردووکیان بکەرن .**

**ئازادو نەوزاد هاتنە ئێرە**

**بکەرن فرمان (ن) کۆتایی کەسیە بۆ کۆ .**

(5) مقابل (بۆ) ئامرازێکە ڕێچکەی بکەر پیشان دەدا .
ئێرە : ئاوەڵکارە .

تێبینی : ڕاناوی نیشاندانی دوور یان نزیك ( ئەمە ئەمانە ـ ئەوە ـ ئەوانە ) دەتوانن ببن بە بکەر ئەگەر هاتوو بوونە بکەر لە ڕستەدا خۆیان لەگەڵ کۆتایی کەسی فرمان لە ڕووی تاك و کۆوە دەگونجێن ئەگەر بکەر کە ڕاناوی نیشاندانە تاك بوو کۆتایی کەسی فرمانیش هەر بە تاك دێتە پێش وە ئەگەر کۆ بوو کۆتایی کەسی فرمان هەروا کۆ دەبێت هەروەك لە خوارەوەدا دیارە .

( ئەمە هات ) ( ئەوە هات )

لەهەردوو ڕستەکانی سەرەوەدا ڕاناوی نیشاندان ( ئەمە ، ئەوە ) بۆ تاکە لەبەر ئەوە فرمانی ڕستەکە (هات) هەروا بە تاکی هاتوە . دەتوانین نموونەش بۆ کۆ بهێنینەوە وەك ( ئەمانە هاتن ، ئەوانە هاتن ) لە ڕستەی سەرەوەدا ( ئەمانە ، ئەوانە ) بۆ کۆن لەبەر ئەوە فرمانی (هات) کۆتایی (ن) وەر ئەگرێ بۆ کۆیە بۆیە دەڵێن (هاتن) .

بکەر لە زمانی کوردیدا دەتوانێ دیارخەر وەربگرێ و بە یارمەتی (ی) اضافة پێکەوە ببەسترێتەوە هەروەك لەم ڕستەیەی خوارەوەدا دیارە : ـ

**ئازادی زیرەك هات**

**لە ڕستەی سەرەوەدا (بکەر) لە ( ئازادی زیرەك ) پێكهاتوە (ئازاد) بە ووشەی زیرەك دیارخراوە لەبەر ئەوە پێی دەوترێ (دیارخراوە) . بە ووشەی (زیرەك) ئەوترێ (دیارخەر) هەردووکیان بە یارمەتی (ی) اضافة پێکەوە بەستراونەتەوە لە زمانی کوردیدا ئەم حاڵەتە زۆر باش دیارە .**

**بکەر دەتوانێ ڕاناوی کەس بێت لێرەدا ( ڕاناوی کەس ) دەبن بە دوو بەش : ـ**

**1 ـ ڕاناوی کەسی جودا .**
**2 ـ ڕاناوی کەسی لکاو .**

ڕاناوی کەسی جودا بریتیی یە لە ( من ـ تۆ ـ ئەو ـ ئێمە ـ ئێوە ـ ئەوان ) . ڕاناوی سەرەوە دەتوانن ببن بە بکەر بۆ نموونە : ـ

**من هاتم**

**بکەر فرمان**

ڕاناوی لکاو دەتوانێ ببێ بە بکەر لە ڕستەدا لێرەدا ڕاناوی لکاو لەگەڵ فرمانی تێپەڕ لە کاتی ڕابووردوو

دەردەکەوێ بۆ نموونە :
کردن ـ کردت ـ کردم
کردمان ـ کردتان ـ کردیان
لە ڕستەکانی سەرەوەدا ڕاناوە لکاوەکان ( م ـ ت ـ ی ـ مان ـ تان ـ یان ) بکەرن لە ڕستەدا .
ڕاناوی لکاو بە بەرکار دەلکێ لە ڕستەدا ئەگەر هاتو بەرکار هەبوو بۆ نموونە :
نامەم نووسی .
نامەت نووسی .
نامەی نووسی .
لەبەر ئەوەی لە ڕستەکانی سەرەوەدا بەرکار هەیە (نامە) ڕاناوە لکاوەکان بە بەرکار لکاوە وشەی (نامەیە) ئەگەر فرمانی ڕستەکانی ڕابووردوو بەردەوام بوو ڕاناوی ـ لکاوی بکەر بە ئامرازی (دە) دەلکێت بۆ نموونە :
دەم نووسی .
دەی نووسی .
دەت نووسی .
دەمان نووسی .

**تێبینی** : لە ڕستەی کوردیدا دوو فۆرم هەیە :
**1 — نیهاد** .
**2 — بکەر** .
1 — نیهاد : لە ڕستەی ناوی بەدیار دەکەوێ وەك لە خوارەوەدا دیارە :
(من) خوێندکارم .
ڕاناوی جودا (من) لێرەدا (نیهادە) چونکە ڕستەکە ڕستەیەکی ناوییە هەروا ڕاناوی (من) لە ڕستەی ( من دەخوێنم ) بکەرە چونکە لە ڕستەدا فرمانێکی ئاشکرا هەیە وەك ( من دەخوێنم ) جیاوازی ( منی یەکەم و منی دووەم ) دەگەڕێتەوە سەر ڕستەکە خۆی :
1 — ( قوتابیەکە ) هات ناسراوە (بکەرو نیهاد)
2 — ( قوتابیەك ) هات / نەناسراوە / ( بکەرو نیهاد )
لە زمانی کوردیدا ( بکەر یا نیهاد ) دەتوانن ناوی ( وجودی ) بن ( خوێندکار هات ) .
**2 — گوزارە**

گوزارە لە زمانی کوردیدا دەکرێت بە دوو بەش :
**1 — گوزارە فرمانە** .
**2 — گوزارە لەدوو بەش پێك‌هاتوە** .
**1 — گوزارە فرمانە** : لێرەدا گوزارەی ڕستە فرمانێکە بۆ نموونە ( کوڕەکە هات ) ، ( چراکە داگیرسا ) ، ( ئەوزاد ڕۆیشت )

لە ڕستەکانی سەرەوەدا دیارە کە گوزارە لە فرمانی (هات) (ڕۆیشت) (داگیرسا) پێك‌هاتووە . وەنەبێ لێرەدا هەر فۆرمێکی فرمان بەکاربێت ، بەڵکو فرمان دەتوانێت تێپەربێ یان تێنەپەر بێ کاتی ڕابووردووبێ یان کاتی ئێستا .
**2 — گوزارە لە دوو بەش پێك‌هاتوە** : لێرەدا گوزارەی ڕستە لە ناوێك و فەرمانی یارمەتی دەربوون دروست دەبێ بۆ نموونە ( بابە تاهیر کوردە ) لێرەدا گوزارە دەربڕینی (کوردە) ئەم دەربڕینە لە (کورد) پێك هاتوە (کورد) ناوێکە بەلام کاتی ئێستا فرمانی یارمەتی دەری (بوون) ە . لەبەر ئەوە ئەتوانین هەمان ڕستە لەکاتی ڕابووردوودا پیشان بدەین وەك ( بابە تاهیر کوردبوو ) (کوردبوو) لە (کورد + بوو) بە پێی ئەمە (کوردە) (کوردبوو) ئەمانە گوزارەی ڕستەی نیهادی ڕستەکە لە حاڵەتی ڕابووردوو ئێستادا وشەی (بابە تاهیرە ) .
وەنەبێ گوزارە لەناو بەشی فرمان پێك هاتبێ بەتەنها بەڵکو (ئاوەڵناو) یش دەتوانێ ڕۆڵێکی سینتاکسی بگێڕێ وەك لە نموونەی خوارەوەدا دیارە :
<u>**نەسرین جوانە**</u>
**گوزارە پێك‌هاتوە لە (جوان + ە ) ڕستەی دووەم ( نەسرین جوان‌بوو ) گوزارە پێك‌هاتوە لە (جوان + بوو) لەهەردوو ڕستەکانی سەرەوەدا ووشەی (جوان) بەکارهاتوە کە ئاوەڵناوێکە لە زمانی کوردیدا . زۆر جار وادەبێ کە بەشی ناوی گوزارە لە ئاستی خۆیدا لە ( دیارخەرو دیارخراو ) پێك‌هاتوە ، کە بە یارمەتی اضافة پێکەوە بەستراونەتەوە بۆ نموونە :**
**دیلان شاعیرێکی کوردە .**

( شاعیرێکی کوردە ) ئەمە بەشی ناوی گوزارەیە پێك‌هاتوە لە ( شاعیرێك + ی + کورد ) ، (شاعیرێك) لێرەدا (دیارخەرە) (ی) اضافەیە (کوردە) دیارخراوە .
**3 — بەرکار** : بەرکار زاراوەیەکە جێگای (مفعول) دەگرێتەوە لە

زمانی عەرەبیدا زاراوەی بەرکار دەمێکە لە ڕێزمانی کوردیدا بەکار دێت بەرکار لە ڕووی واتاوە : ئەو وشەیە کە ڕوودانی کاری تێدا دیارە بۆ نموونە : ( ئازاد نامە دەنووسێ ) لەناو ئەم ڕستە سادەیەدا ڕوودانی کارکە نووسینە لەناو وشەی (نامە) دا دیارە لەبەر ئەوە وشەی نامە (بەرکارە) لەڕستەدا .

بەرکار وەڵام لەسەر پرسیاری (چی) ؟ دەداتەوە بۆ نموونە ( تۆ چی دەخوێنیتەوە ؟ ) ( من نامە دەخوێنمەوە ) لێرەدا (نامە) وەڵامی پرسیاری ( چی ؟ ) یە . لەناو ڕستەدا ئیشی کارێك یەکسەر لەناو وشەیەکی ڕستەدا دیارە لەبەر ئەوە بەم جۆرە وشەیە ئەوترێ بەرکاری یەکسەر وەك لە خوارەوەدا دیارە : -

**سیر وان کتێب دەخوێنێتەوە .**

لەم ڕستەیەدا وشەی (کتێب) یەکسەر کاری خوێندنەوەی تێدا دیارە لەبەر ئەوە وشەی (ی) (کتێب) بەرکاری یەکسەرە .

لە زمانی کوردیدا جۆرە بەرکاریەکی تر هەیە کە کاری ڕستەی بەهۆوە تێدا دیارە بۆ نموونە : ( من بەتۆم ووت ) ، ( من بەقەڵەم نامە دەنووسم ) . لەم ڕستە سادەیەدا وشەی (تۆ) کاری ووتنی بەهۆی ئامرازی (بە) تێدا دیارە لەبەر ئەوە وشەی تۆکە ڕاناوێکە بەرکاری نایەکسەرە لەڕستەدا . بەپێی باسی سەرەوە بەرکار لەزمانی کوردیدا دووجۆرە :

1 — بەرکاری یەکسەر .
2 — بەرکاری نا یەکسەر .

1 — بەرکاری یەکسەر : بەرکاری یەکسەر دەتوانێ ناوێکی تایبەتی بێ بۆ نموونە : من (ڕزگارم) دیت ، هەر وەها کار دەتوانێ ناوێکی کۆبێت بۆ نموونە : ( من خوێندکارانم دیتن ) . بەرکاری یەکسەر ناوی تاك و کۆیە بۆ نموونە : من نووسەر دەبینم

بەرکاری یەکسەر تێپەڕە

بەرکاریناوی ناسراو بۆ نموونە : ( من کورەکە دەنێرم ، بەرکار ڕاناوی نیشاندانە :

( من ئەمە ڕادەسپێرم ) ... تاك ( من ئەمانە ڕادەسپێرم ) ... کۆ

بەرکارناوی نەناسراوە ( شاسوار چیرۆکێك دەنووسێت ) . بەرکار ڕاناوی نیشاندانە ( تۆ ئەوە ڕادەسپێری ) تاکە . ( تۆ ئەوانە ڕادەسپێری ) کۆیە. بەرکارڕاناوی کەسی یە (کەسی جودا) من (تۆم) تەرخان کرد . ئێمە (ئەومان) هێشتەوە . بەرکار ڕاناوی کەسی لکاوە : سبەی ئازاد دە(م) بینێ / تاك ، سبەی دە (مان) بێنێ / کۆ

**بینای بەرکار** : لەزمانی کوردیدا بینای بەرکار هەیە ، بینای بەرکار یەکسانی نێوان بەرکارو کۆتایی فرمان لەڕووی تاك و کۆوەو کەسەوە پیشان دەدات بۆ نموونە : من کوڕێکم دیت

لێرەدا یەکسانی لە نێوان (کوڕێك) کە بەرکارە لەگەڵ (دیت) کە فرمانە هەیە ئەم یەکسانیە بینای بەرکاری پێ دەوترێ لێرەدا وشەی کوڕێك تاکە هەروا فرمانەکەشی لەڕستەدا تاك پیشان دەدات لەزمانی کوردیدا نموونە بۆ ئەم حاڵەتە زۆرە :

ئازاد چیرۆکێکی .... نووسی - « تاکە »
سیروان نامەیەکی .... نووسی - « تاکە »

من دوو نامەم .... نووسین - « کۆیە »

بینای بەرکار یەکسانی لە کۆشدا پیشان دەدات

**تێبینی** : ( ئەوان دەنووسن ) (ن) کۆتایی کەسی یە بۆ (ئەوان) کە بکەرە وەکاتی ئێستایە فرمانەکە . ( دوونامەم نووسین ) (ن) بۆ کاتی ڕابووردووە ئەچێتە سەر بەرکار .

لێرەدا (پێتی ن) کە کەوتۆتە دوای فرمانی (نووس) کە فرمانێکی تێپەڕە لە کاتی ڕابوردوودا دەگەڕێتەوە سەر (دوونامە) کە بەر کاری ڕستەکەیە دەتوانین بەم حاڵەتە بڵێن یەکسانی (بکەرو فرمان) لەڕووی کۆوە نیشانەن ئەمەش پتیی (ن) کە بە کۆتایی فرمانی ڕابوردووی تێپەڕ دەلکێ نموونەش بۆ ئەوە وەك خوارەوەیە : -

( تۆ دوو نامەت نووسین )
(تاك - کۆ)

بینای بەرکار لە زمانی کوردیدا دوروست دەبێت بەمەرجێ فەرمانی ڕستەکە فرمانێکی تێپەڕی بێ لەکاتی ڕابووردوودا - بۆ نموونە : - (من تۆم نارد)
(من ئێوەم ناردن)

(زۆرم دیتن) .
له هه‌رسێ ڕسته‌کانی سه‌ره‌وه‌دا فـرمانـه‌کانی (نـارد) (دیت) فه‌رمانی تێنه‌په‌ڕن له‌کاتی ڕابوردوودا

## جیاوازی نێوان بینای به‌رکارو بینای بکه‌ر

1 – بینای به‌رکار فه‌رمانه‌که‌ی تێپه‌ره له‌کاتی ڕابوردوودا وه‌کو لێره‌دا دیاره
( من زۆرم دیت ) . تێپه‌ڕه له‌کاتی ڕابووردوودا . به‌ڵام بینای بکه‌ر فه‌رمانه‌که‌ی تێپه‌ڕه له کاتی ئێستا ( من تۆده‌نێرم ) تێپه‌ڕه ـ کاتی ئێستا
2 – بینای به‌رکار هه‌ر له‌گه‌ڵ فرمانی تێپه‌ره ده‌بێ به‌ڵام بینای بکه‌ر له‌گه‌ڵ فرمانی تێنه‌په‌ریش ڕێك ده‌که‌وێ بۆ نموونه :

| بینای بکه‌ر | فرمان |
|---|---|
| من ده‌بینم | تێپه‌ڕه . |
| ئێمه ده‌بینین | تێپه‌ره . |
| من هاتم | تێنه‌په‌ره . |

2 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر : ـ به‌رکـاری نایـه‌کسه‌ر بـه‌رکاری دووه‌می ڕسته‌ی کوردی‌یه ئه‌م جۆره‌به‌رکاره ووشه‌یه‌کـه له‌ناو ڕسته‌دا کاری فه‌رمانی ڕسته‌ی به‌نیانی (غیر مباشر) تیادیاره له‌ر ئه‌وه ناوی به به‌رکاری نایه‌کسه‌ر براوه .
بۆ دروست بوونی به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ئه‌بێ ئامرازی تیابێ .
بۆ نموونه ( دوێنێ من له‌تۆ ده‌گه‌ڕام ) .
( له ـ به ـ له‌گه‌ل ـ بێ ـ بۆ ) ئامرازن به‌رکـاری نایـه‌کسه‌ر دروست ئه‌که‌ن .
له ڕسته‌ی سه‌ره‌وه‌دا ووشـه‌ی (تۆ) بـه‌رکاری نـایه‌کسـه‌ره چونکه : ـ
1 – کاری فرمانی (ده‌گه‌ڕام) ی به نیان تێدا هه‌یه هه‌روا ،
2 – ئامرازی (له) ی که‌وتۆته پێش .

1 – من له زنجیرو ته‌ناف و داو باکم نیه ) . به‌رکاری نایه‌کسه‌ره
2 – من له‌گه‌ل براده‌ران ده‌چمه سه‌یران .
3 – من بۆ دیتنی تۆ هاتم .
4 – من به چاویلکه ده‌خوێنمه‌وه .
5 – پێ ی مه‌لێن .
به‌رکاری نایه‌کسه‌ر له‌گه‌ڵ فرمانی ( تێپه‌ڕو تێنه‌په‌ڕ ) دێن بۆ نموونه : ـ

( من بۆ ئازادی خوێن ده‌ڕێژم )
نایه‌کسه‌ر یه‌کسه‌ر تێپه‌ڕ .

( سیروان له‌گه‌ڵ شاخه‌وان هات ) .
نایه‌کسه‌ر تێنه‌په‌ڕ

به‌رکاری نایه‌کسه‌ر له‌م زمانه‌دا له زۆر ڕووه‌وه ده‌رده‌که‌وێ وه‌ك له خواره‌وه‌دا دیاره : ـ 1 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ناوی گشتی‌یه بۆ نموونه : ـ ( من بۆ گه‌ل تێ ده‌کۆشم ) .

2 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ناوێکی تایبه‌تی‌یه بۆ نموونه : ـ
( من به ئازاد ده‌ڵێم ) .
3 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ناوێکی تاکه ( کرێکار له‌گـه‌ڵ جوتیـار خه‌بات ده‌کات ) .
4 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ناوێکی کـۆیه ( من بـۆ خوێنـدکاران لێکۆڵینه‌وه ده‌نووسم ) .
5 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ناوێکی (مجرده) ( ئێمه بۆ سه‌ربه‌ستی هه‌وڵ ده‌ده‌ین )
( هه‌موومان بۆ مرۆڤایه‌تی خه‌بات ده‌که‌ین ) .
6 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ناوێکی (مه‌عنایه) ( من به‌هه‌ست له‌تۆ ده‌گه‌م ) .
( شاهۆ به‌هۆش له ئێمه گه‌یشت ) .
7 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ناوێکی نه‌ناسراوه ( به کوڕێك ده‌ڵێم )
8 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ناوێکی ناسراوه ( ووتاره‌که به کچه‌که راده‌سپێرم ) .
9 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ناوی بکه‌ره ( له‌نووسه‌ر ده‌پرسم ) .
10 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر چاوگـه ( سبه‌ی له نـووسین تـه‌واو ده‌بم ) .
11 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر دیارخراوه ( په‌ری‌زاد له‌گه‌ڵ شاگردی قوتابخانه هات ) .
12 – به‌رکاری نایه‌کسه‌ر ڕاناوی که‌سی جودایه ( ژیان به ئێوه

خۆش دەبێ ) .

٣ — بەرکاری نایەکسەر ڕاناوی لکاوە ( بەیانی تۆ لەگەڵم وەرە ) .
( سبەی پێت دەڵێم ) . ( ئێستا ئێوە لە ئێمە مەپرسن ) .
( جاری بۆیان مەهێنن ) .

٤ — بەرکاری نایەکسەر ڕاناوی نیشاندانە ( بە ئەمە مەڵێ ) .
( بۆ ئەمانە مەگری ) .

**تێبینی** : ئەگەر ئامرازی (بە) (لە) چووە سەر ڕاناوی ـیشاندان ئامرازی ە دەکەوێ دەمینێتەوە ( مە ، مانە ، وە ، ـوانە ) .
ـوای ئەوە ئەم فۆرمانە دروست دەبن ( بەمە ، بەمانە ، بەوە ، ـەوانە ، لەمە ، لەمانە ( لەوە ، لەوانە ) .

٤ — بەرکاری نایەکسەر ڕاناوی نادیارە بۆ شت (بە چ بنازم) (لە چ بپرسم) .

١٤ — بەرکاری نایەکسەر ڕاناوی نادیارە بۆ کەس ( قسەکە بە کامە بڵێم )

٢ — بەرکاری نایەکسەر ڕاناوی نادیارە بۆ ژمارە ( پرسیارەکە لە هەمووان دەپرسم ) .

## « ئاوەڵکار »

ئەو ووشەیە لە ناو ڕستەدا کە دەگەڕێتەوە سەر فرمانی ڕستەکانی فرمانەکە پیشان بدا هەروەك لە نموونەکانی خوارەوەدا دیارە بۆ نموونە : ـ

1 — دوێنێ هەواکە سازگار بوو .
2 — ئیمڕۆ سەر لە بەیانی کابرام دیت .
3 — هەموو ساڵ سەر لە خاڵۆم دەدەم .
4 — پێری براکەم گەڕایەوە .
5 — ساڵ بەساڵ برادەرەکەم دەبینم .

لە ڕستەکانی سەرەوەدا ووشەکانی ( دوێنێ ـ ئەمڕۆ سەرلەبەیانی ، هەموو ساڵ ، پێرێ ـ ساڵ بە ساڵ ) ئەمانە هەموویان دەگەڕێنەوە سەر فرمانی ڕستەکان ( بوو ـ دیت ـ دەدەم ـ گەڕایەوە ـ دەبینم ) ووشەکان توانیویانە کاتی ڕودانی کارەکان دیاربخەن وەك دەڵێی ( کەی ئاوەکە سازگاربوو ؟ ) لە وەڵامدا دەڵێین ( دوێنێ ـ پێرێ ـ ئەمڕۆ ـ هتد ئاوەڵکاری کات لە زمانی کوردیدا وەڵام لەسەر پرسیاری (کەی) ؟ دەداتەوە بۆ نموونە دەڵێی : ( براکەم گەڕایەوە ) لە پرسیاردا دەڵێی ( کەی براکەت گەڕایەوە ) لێرەدا لە شوێنی کەی کە پرسیارە ئاوەڵکاری کات دائەنێین کە ناوێکە کاتی گەڕانەوەی (براکەم) پیشان دەدا لەبەر ئەوە دەڵێین ( پێرێ براکەم گەڕایەوە ) ( دوێنی ـ ئەمڕۆ ـ هەفتەی ڕابووردوو ) .

ئاوەڵکاری کات لەناو ڕستەی کوردیدا چەند فۆڕمێکی لەڕووی دروست بوونەوە هەیە چونکە ئاوەڵکاری کات هەیە ووشەیەکی سادەیە وەك ( دوێنێ ـ پێرێ ـ ئەمڕۆ ) هەروەها ئاوەڵکاری کات دەتوانێ لە کۆمەڵە ووشەیەکیش پێك هاتبێ وەك ( ئەمڕۆ سەرلە بەیانی ) ئەم کۆمەڵە ووشەیە پێکهاتوە لە ( ئەمڕۆ + سەر + بەیانی ) ئاوەڵکاری کات لە ڕووی بیناوە دەتوانێ لە ( دیارخەرو دیارخراو ) پێکهاتبێ وەك ( هەمووساڵ ) لێرەدا هەموو دیارخەرە (ساڵ) دیارخراوە هەردووکیان بەسەریەکەوە ئاوەڵکاری کاتن ئاوەڵکاری کاتی سەرەوە ( هەموو ساڵ ) هەروەك دیارە بەبێ نیشانە پێکەوە بەستراونەتەوە بە واتای لە نێوان ووشەی ( هەموو ساڵ ) هیچ نیشانێکی پەیوەندی نی‌یە . هەروا ئاوەڵکاری دیارخەرو دیارخراو دەتوانی بەیارمەتی نیشانەکانی اضافەت پێکەوە ببەسترێتەوە وەك ( هەفتەی جارێك ) لێرەدا (هەفتە) دیارخەرە جارێك دیارخراوە نیشانەی اضافەت توانیویەتی ووشەکانی (هەفتە) (جارێك) پێکەوە ببەستیتەوە ئاوەڵکاری کات ئەتوانێ لە نێوان ووشەی یەکەم و دووەم ماوە پیشان بدات هەروەك ( ئەمڕۆ تا ئێوارە ) لێرەدا ماوەیەك لە نێوان ئەمڕۆ وئێوارە پیشان دراوەیە بە یارمەتی ئامرازی (تا) هەروا ئاوەڵکاری کات دەتوانێ بکەوێتە ناو قەوارەی ئامرازی لێکدراو ( لە .... ەوە ) لێرەدا فۆرمی لە دوێنی‌وە ، لە پێرێ‌وە ، لە ئەمڕۆوە دروست دەبێ لێرەدا ئەم فۆرمانە وەلامی پرسیاری ( لەکەیەوە ) ( لە + کەی + ەوە ) ەن .

**تێ بینی :**

لە زمانی کوردی‌دا هەبوونی ئاوەڵکاری کات پیشانی

دەدات کە فەرمانی ڕستەکە لە کاتی داهاتودایە بۆ نموونە : ـ

( سبەی دەست بە نووسینی چیرۆکەکە دەکەم ) .

ئاوەڵکاری کات دەتوانێ بگەڕێتەوە سەر فەرمانی ڕستە ، فەرمانەکە چ تێپەڕبێ یان تێنەپەڕ چ کاتی ڕابووردوو بێ چ کاتی ئێستا .

ئاوەڵکاری کات دەتوانێ بەشێکبێ لە کاتێکی تر بۆ نموونە : ـ

ئەمڕۆ سەر لە بەیانی لەماڵەوە دەرچووم

2 — ئاوەڵکاری شوێن :

ئاوەڵکاری شوێن ، شوێنی ڕوودانی فەرمانی ڕستەکە پیشان دەدات بۆ نموونە : ـ

( دوێنێ لە کتێب خانەدا چیرۆکێکم خوێندەوە )

لەم ڕستەیەدا (کتێب خانە) شوێنی ڕوودانی فەرمانی خوێندنەوە پیشان دەدا لەبەر ئەوە پێی دەوترێ ئاوەڵکاری شوێن ئاوەڵکاری شوێن دەتوانێ لە کۆمەڵە ووشەیەك پێکهاتبێ کە بە یارمەتی اضافەت پێکەوە بەسترابنەوە بۆ نموونە : ـ

( دوێنێ لە کتێبخانەی زانکۆدا باسێکم نووسی ) .

لە ڕستەی سەرەوەدا ئاوەڵکاری شوێن پێکهاتووە لە لێکدانی سینتاکس ( قوتابخانەی زانکۆ ) دیارخراوە (زانکۆ) دیارخەرە هەردووکیان بە ئیزافەت (ی) پێکەوە بەستراونەتەوە ئاوەڵکاری شوێن دەکەوێتە نێوان هەردوو بەش ئامرازی وەك ئامرازی ( لە .... دا ) بۆ نموونە : ـ

( ئازاد لە قوتابخانەدا بە یەکەم دەرچوو ) .

لە ڕستەی سەرەوەدا ئاوەڵکاری شوێن (قوتابخانە) کەوتۆتە ناو قەوارەی ئامرازی (لە .... دا) ئەگەر هاتو ئاوەڵکاری شوێن دیارخەرێك یان چەند دیارخەرێکی بەدوا داهاتبوو بەشی دووەمی ئامراز کە لە فۆرمی (دا) پێکهاتووە دەکەوێتە پاش دیارخەری کۆتایی بۆ نموونە : ـ ( ئازاد لە قوتابخانەی ناوەندیدا بە یەکەم دەرچوو ) . لەم ڕستەیەدا بەشی دووەمی ئامرازی (دا) بە ووشەی (ناوەندی) لکاوە کە دیارخەری ئاوەڵکاری کەیە ئاوەڵکاری شوێن وەڵام لەسەر پرسیاری (کوێی) دەداتەوە .

( ئاسۆ لە بەشی کوردی زانکۆی سلێمانی دادەخوێنێ ) .

لەم ڕستەیەدا ( بەشی کوردی زانکۆی سلێمانی ) وەڵامی پرسیاری کوێیە ، چونکە دەتوانین لەشوێن ئەو پرسیاری کوێ دانێین ( ئاسۆ لەکوێدا دەخوێنێ ) لەوەڵامدا دەووترێ ( بەشی کوردی زانکۆی سلێمانی ) .

ئاوەڵکاری شوێن لەم ڕستەیەدا دیارە کە فرمانەکەی جووڵانەوەی تیا نییە هەروەك لە ڕستەی سەرەوەدا دیارە

( دوێنێ لە کتێبخانەی زانکۆدا باسێکم نووسی ) .

لە ڕستەی سەرەوەدا ( فرمانی نووسین ) جووڵانەوەی تیا نییە .

## سەرچاوەکان


1 — سعید صدقی کابان مختصر صرف و نحوی کوردی جزئی 1 ـ بەغدا ـ سالی 1928 .

2 — نوری علی ئەمین ڕێزمانی کوردی ـ سلیمانی ، 1960 .

3 — مسعود محمد سوریکی خامە بە دەوری ڕاناودا .
گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد بەرگی 2 بەشی 2 بەغدا ، 1974

4 — مسعود محمد چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی ـ بەغدا ، 1976 .

5 — محەمەد ئەمین هەورامانی سەرەتاییك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی ، بەغدا ، 1974

6 — ئەحمەد حسن ئەحمەد ڕێزمانی کوردی ـ بەغدا ، 1976

7 — د . ئەورەحمانی حاجی مارف ووشەی ڕۆنان لە زمانی کوردیدا بەغدا ـ 1977

8 — ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لیژنەی زمان و زانستەکانی ـ 1976

9 — د . کوردۆییف ك . ك . زمانێ کوردی ـ ڕێزمان ( بە پیتی لاتینی ) یەریفان ـ 1970

10 — جگەر خوێن ئاوا ئو دەستورا زمانێ کوردی ـ بەغدا ، 1961

11 — مصطفی خرمدل صرف دستور زبان کردی ـ سۆرانی ، تبریز 1347 کۆچی (بەفارسی)

12 — د . ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم: هەندێ ئامرازی سینتاکسی لە زمانی ئەدەبی ئەمڕۆی کوردیدا ، بەغدا 1980 .

13 — د . ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم: ڕستەی لێکدراوی شوێنکەوتووخواز لەگەڵ ڕستەی شوێنکەوتووی دیارخەری لە دیالێکتە ناوەندییەکانی زمانی کوردیدا ، بەغدا سالی 1980 .

14 — د . کوردستان موکریانی: ناو لەڕستەی کوردیدا بەرگ 7 ـ ژمارە 1 ـ زانکو ، سلێمانی ، 1981 .

15 — د . مهدی المخزومی: فی النحو العربی (نقد وتوجیه) الطبعة الاولی ـ بیروت ، 1964 , 1964 (بەعەرەبی)

16 — عباس حسن : النحو الوافی ـ الجزء الاول ـ الطبعة الخامسة دار المعارف بمصر (بەعەرەبی)

17 — توفیق وهبی : قواعد اللغة الکردیة الجزء الاول ـ الباب الاول ، بەغداد ، 1956 (بەعەرەبی)

18 — د . شوقی ضیف : المدارس النحویة ـ الطبعة الثانیة ـ القاهرة 1972

19 — ئەرێندس ئا . ك . کورتەیێکی سینتاکسی زمانی ئەدەبی ئەمڕۆی فارسی . م ـ ل ، 1941 (بەڕوسی)

20 — بەکاییف ج ـ خ ـ زمانی کوردەکانی یەکیەتی سۆڤیەت ، مۆسکۆ ـ 1973 (بەڕووسی) .

21 — کوردۆییف . ك . ك . ڕێزمانی بەراوردکاری زمانی کوردی ـ مۆسکۆ 1978 (بەڕووسی) .

22 — ك . ر . ئەیوبی . س . ئا . سمیرنوڤە دیالیکتی کوردی موکری لینینگراد ، 1968 (بەڕووسی) .

● عبدالستار كاظم ●

# کتێبی «هەندێ ئامرازی سینتاکسی»و چەند تێبینی‌یەك

پێشەکی : لە لایەن ئەمانەتی ڕۆشنبیری‌و لاوانەوە ، کتێبێکی دکتور ئیبراهیم عەزیز ئیبراهیم لەژێر ناونیشانی : « لێکۆڵینەوە لە سینتاکسی زمانی کوردیدا ، هەندێ ئامرازی سینتاکسی لە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆی کوردیدا » لە ساڵی 1980 دا لەچاپ دراو بڵاوکرایەوە .

قەوارەی ئەم کتێبە (96) لاپەڕەی مام ناوەندی‌یە ، دکتۆر بە پێشەکیەکی دوو لاپەڕەیی کتێبەکەی پێشکەش دەکا بەخوێنەران‌و لە کۆتایی ئەم پێشەکی‌یەدا دەڵێ :
« سەرچاوەشم لەبارەی ڕێزمانی کوردی‌یەوە بە کوردی‌و عەرەبی‌و ڕووسی‌و ئینگلیزی بینیوەو چی لە بارەی ئامرازەوە بە وردی خوێندوومەتەوەو سوودم لێوەرگرتوون . . »
هەروەها نموونەکانیشی لە چیرۆکەکانی د . مارف خەزنەدارو د . کاوس قەفتان‌و حوسێن عارف‌و پەندی کوردی ، کەریم شارەزا هەڵبژاردووەو لە بەشی یەکەمی کتێبەکە وەك خۆی دەڵێ لە مێژووی ئامرازەکانی سینتاکسی کۆڵیوەتەوە ، بەڵام لەڕاستی‌دا ئەم بەشە هەر تەنها مێژووی ئامرازەکان نی‌یە بەڵکو هەندێ ڕەخنەشی تیا هاتووە ، بۆیە ئەم بەشە بەجێ دێڵم‌و ئەو سێ بەشەکەی کتێبەکە ئەخەمە ژێر (وردبینەوە) و ئەنجامەکەی پێشکەش بە خوێنەرانی بەڕێز دەکەم .
بەشی دووەمی کتێبەکە ئامرازەکانی سینتاکسی ئەم بەشە (7) لاپەڕەی پڕکردووەتەوە واتە لاپەڕە (23) تا لاپەڕە (29) و بەسەر سێ لقدا دابەش کراوە :

**لقی یەکەم**

———— : (ل / 23) لەم لقەدا باسی زاراوەی (ئامراز) دەکاو دەڵێ : « ئێمە لەم کارەدا هەر ئامرازی سینتاکسی باس دەکەین بە مەبەستی ئەو جۆرە ئامرازانە ، کە دوو ڕستە پێکەوە دەبەستنەوە یان ڕستەیەك دەگەیەنتە ڕستەیەکی‌تر . » واتە لێرەدا مەبەستی خۆی دەردەبڕێ‌و هەر تەنها باسی ئەو ئامرازانە دەکا کە ئامرازی سینتاکسین‌و دوو ڕستە بەیەکەوە دەبەستن یا دەگەیەنن .
بەڵام بەداخەوە ، باسی ئەوەی نەکردووە کە ئایا زاراوەی «ئامراز» ڕاستە یان نە وە چ واتایەك دەبەخشێ ، یا چۆن دروست بووەومێژووی ئەم زاراوە چی‌یەو ئایا تازەیە یا هەر لە کۆنەوە بەکار هاتووە بەڕای من دەبوایە ئەم هەموو خاڵانەی باس بکردایە چونکە باس باسی زاراوەکەیە نەك هەر بەکار هێنانی‌و بەس ...
بەپێی بۆچوونی خۆم ، وشەی (ئامراز) یاخود زاراوەی ئامراز بۆ (أداة) ی عارەبی ناشێ چونکە (ئامراز) لە دوو بەش پێکهاتووە ، بەشی یەکەم ( ئام = هام = هەم = هاو ) واتە ( بەرانبەر ، وەك یەك ) = ( صاحب ، مساوی ، مقابل ، مثل ) ی عارەبی .
بەشی دووەمیشی (راز) کە بەرانبەر بە (سرّ) ی عارەبی دەوەستێ ، تێکڕای وشەکە ( بەشداری یەك ڕاز ) یاخود ڕازیان وەك یەکە .
جالێرەدا ئەگەر بە واتای (أداة) بەکار هاتبێ دیارە بەکار

هێنانەکەی مەجازی بێ چونکە پیشەدارو پیشەساز دارو دەزگاکەی ئامرازیەتی و هاوڕێیەتی .
باشترین ئەوەبوو وشەی (ئامێر) ی بەکار بیهێنایە چونکە پڕ بەپێستی وشەی (أداة) ی عارەبی یە .

**لقی دووەم** : ل / 24

لەم لقەدا پێناس دێنێ بۆ ئامرازی سینتاکسی و دەڵێ :
« ئامرازی سینتاکسی ئەو جۆرە ئامرازانەن ، کە دوو ڕستەی سادە بەیەکەوە دەبەستنەوە یان ڕستەیەکی شوێن کەوتوو دەگەیەنتە ڕستەی سەرەکی لە نێو ڕستەی لێکدراوای شوێن کەوتوو خوازدا . »
ئینجا ئەو ئامرازانەی کە قسەیان لەسەر دەکا تۆمار دەکا . لقی سێیەم : ل / 24—25 ، لەم لقەدا ئامرازەکان دەکاتە دوو بەشەوە لە لایەن دروست بوونیان واتە : بەشی (سادە) کە ئەمانەن ) ( ئێستا ، وە ، بەلام ، ئینجا ، ش ، و ، ، کە ، تا ، بۆیە ، یا ، ئەگینا ) و بەشی (لێکدراو) کە ئەمانەن :
« ئەوسا ، بەڵکو ، وەکو ، بۆ ئەوەی ، کەچی ، چونکە ، ئەگەر . » جا لەسەر ئامرازە لێکدراوەکان یەکە یەکە دەدوێ .
ئەوسا : دەربارەی ئەم ئامرازە دەڵێ :
« ئامرازێکی لێکدراوە ، چونکە لە دوو بەش پێکهاتووە . لە (ئەو) و (سا) .
لەسەری دەڕواو دەڵێ :
« جا لێرەدا ( ئەو ڕاناوی نیشاندەرە بۆ دوورو لە هەمان کاتیشدا ڕاناوی جودای کەسی سێیەمی تاکە . » ل / 26 »

لێرەدا مامۆستا بڕیار دەدا کە وشەی (ئەو) لە ئامرازی (ئەوسا) دوو ئەرکی هەیە لە لایەکەوە ڕاناوی نیشاندەرەو لە لایەکی ترەوە ڕاناوی جودای کەسی سێیەمی تاکە بۆیە ناچار بووە ئەم بڕیارە بدا بۆ دەرباز بوون لەم تەگەرەیە ئەگەر مامۆستا باسی وشەی (ئەو) ی بکردایە بەبێ ئەوەی بلێ ( جا لێرەدا گومانێك پەیدا دەبوو کە مەبەستی ئەوە نەبووە بەلام کە ووتی (جالێرەدا) ئەوە بەڕاست و ڕەوان مەبەستەکەی دەر دەخا کە مەبەست (ئەوسا) یە . (ئەو) وەك وشەیەك لە قسەی ئاسایی‌دا ڕاناوی جودای کەسی سێیەمی تاکە ، هەروەها (ئەوە) ڕاناوی نیشاندەرە بۆ دوور بە مەرجێ نیشاندراوە کە لە قسەدا نادیار بێ ( ئەوە پیاوە ) ، بەلام ئەگەر نیشاندراوەکە دیاربوو ، ئەوسا وشەی (ئەوە) دەبێتە دوو کەرتەوە ، یەکەم (ئەو) و دووەم (ە)یەو نیشاندراوەکە . دەکەوێتە نێوانی هەردوو کەرتەکەی وەك ( ئەو کوڕە ـ زیرەکە ) جا لێرەدا پرسیارێك دێتە پێشەوە ، ئایا (ئەو) ی وشەی (ئەوسا) ڕاناوی نیشاندەرە یا ڕاناوی جودای کەسی سێیەمی تاکە یان هەردووکیانە وەك مامۆستا دەڵی ؟ ...

لە شێوەی بەکار هێنانی وشەکەدا دەردەکەوێ کە ئەم بەشەی وشەکە واتە وشەی (ئەوسا) ڕاناوی نیشاندەری دوورەو بەس ، بەلام بۆ وای لێهات ؟ بە شێوەی تر بۆچی بەشەکەی دیکەی نەماوە کە (ە) یە ؟ . ئەگەر خوێنەری بەڕێز لێمان ببوورێ تۆزێ وەلامی ئەم پرسیارە دوا دەخەین تاکو لە موناقەشەی قسەکانی مامۆستا تەواو دەبین :
مامۆستا دەڵێ [ (سا) لە ساتەوە هاتووە ، کە واتای (کات) دەدات بەشی (سا) هەروا لە (سات) ە وە کورتکراوەتەوە ؛ ئیتر (ئەو) و (سا) بە هەردوکیان (ئەوسا) یان پێکهێناوە . ]
تاڕادەیەك لاریم لەو قسەیە نی‌یە بەمەرجێ کە (سات) لە وشەی (سەعات) ەوە هاتبێت . واتە وشەی (سات) وشەیەکی بێگانەیەو واتای کات دەدا بە دەستەوە ؛ ئەگەر وابێ دەبێ بلێین وشەی (سات) کە لە بنەڕەتدا (سەعات) بووەو فۆنیمی (ع) سواوەتەوەو بووە بە (سات) ئینجا فۆنیمی (ت) یش سوواوە واتە ووشەی (ئەوسا) لەپێشەوە ( ئەو سەعاتە ) بووە کەبووە (ئەو ساتە) ، بوو بە (ئەو ساە) دوای کەوتنی (ع) و (ت) یەك بەدوای یەك ، **ئینجا لێرەدا دوو بزوێن ڕیز دەبن لەیەك وشەداو دوو بزوێن لە کوردیدا ناگونجێن لەگەل یەکدیدا** بۆیە (ە) کە لابرا
.

**خوێنەری بەڕێز وا لێرەدا بۆت ڕوون بوو کە بۆچی (ئەو ... ە) بوو بە (ئەو) بەبێ (ە) . ئەوە وەلامی پرسیارەکە لێرەدا درایەوە**
...

**وتم من تا ڕادەیەك لەگەڵ مامۆستا دام لەو ڕایەی کە دەڵێ (سا) لە ساتەوە هاتووە بەو مەرجەی ساتیش لە سەعاتی عارەبی هاتبێ ...**
**بەلام با تەماشای لاپەڕە (42) بکەین و بزانین مامۆستا دەربارەی هەمان وشە واتە (ئەوسا) چی دەڵی ؛ لەم لاپەڕەیەدا دەڵێ :**
**« گەلێ جاری واش هەیە ، لە بریتی ئامرازی (ئەوسا) (ئەوجا) دروست دەبی و بەکار دەهێنرێت . » لەسەری دەڕواو دەڵێ :**
**« لێرەدا (ئەوجا) لە بریتی ئامرازی (ئەوسا) بەکار هاتووەو دوو**

ڕستەی بەیەکەوە بەستوونەتەوە . (ئەوجا) لە (ئەو) و (چار) پێکهاتووە ، وشەی جار یانی (کات ـ سات) ، بەلاّم لێرەدا پیتی (ر) کەوتووە ، هەرچۆن پیتی (ت) لە (سات) ەوە کەوتبوو لەوێشدا ماوەتەوە (جا) بەواتای (جار) و (ئەوجا) دروست بووە . »

دەڵێم (جار) لە کوردیدا واتای (کات) نادا ، واتای ( تاو ، هاوار ، بانگ ، گل ) یان ( دفعه ، نوبه ، کرّه ، مرة ، صرخة ، نداء ) ی عارەبی دەدا .

جا ئەگەر وابێ واتە (سا) لە (سات) ەوە وەرنەگیراوە چونکە (جار) جێگای دەگرێو بگەڕێین لە چی‌یەوە وەرگیراوە ؟

بە بۆچوونی خۆم (سا) یا لە (سان) ی کوردی وەرگیراوە یان لە (سارەوە) . سانیش واتای (بەرد) پارچە ، بەش ، دەستوور وێنە ) ی هەیە واتە بەرانبەر بە ( قاعده ، طرز ، حصة ، قطعة ، حجر ) ی عارەبی دەوەستێتەوە . جا بەرای من لە (سان) بەواتای بەرد وەرگیراوە چونکە ئەم وشەیە وشەیەکی مێژوویی‌یەو دەگەڕێتەوە بۆ ( دەوری حەجەری مرۆڤایەتی ) کە ژماردن بە بەردو دان‌و شت دەکرا .

(سار) یش واتای (لا ، سۆ) دەدا بۆیە دەتوانین بڵێین (سا) واتای (جا) دەدا بەدەستەوەو هەردوو وشەکە واتای کات هەرگیز نادەن ، بەلاّم هەر چۆنێ بێ ئەگەر لە (سات) یا (سان) یا (سار) هاتبێت هەروەهای بەسەر دێت واتە :

لەبنەڕەتدا وشەکە ( ئەو ساتە ، یا ئەو سانە ، یا ئەو سارە ) بووەو دوای کەوتنی (ت) ی (سات) یا (ن) ی (سان) یا (ر) ی (سار) وشەکە بووە بە (ئەو ساه) و لێرەدا دوو بزوێن ڕیز دەبن ئەوەیش ناگونجێو دەبێ یەکێك لەو دوو بزوێنە لابردرێ جا وشەکە بووە بە (ئەوسا) ...

**بەلکو** : ل / 24 ، دربارەی ئەم ئامرازە دەڵێ :

أ ـ (کو) بەشێکە لە دروست کردنی ئامرازی لێکدراوی (بەڵکو) . کو لە عاستی خۆیدا ئامرازێکی گەیەنەرە لە دیالێکتی کرمانجی خوارووودا .

ب ـ بەشەکەی تری ئامرازی مەبەست (بەڵ) ە ، کە بەشێکی نادیارەو بێ‌واتایە . هەبوونی بەس بۆ دروست کردنی ئامرازی ناوبراوە . (؟)

بە وردبوونەوە لەم بەشە دەردەکەوێت لە (بەلاّم) یان (بەلاّن) ەوە هاتبێت پاش کەوتنی (ام) ، (ان) لەیەکەم‌و دووەمدا ، ئەمەش بەڵگەی قەناعەتی ڕاستی ناگەیەنێ ... »

دەڵێم : (؟) لەوانەیە (کو) لە بنەڕەتدا لە (کە) و (ئو) پێکهاتبێ‌و بە هۆی سووك کردنەوە بووە بە (کوو) . (ئـوو) لە دیالێکتی لوڕی‌و زمانی فارسی واتای (ئەو) دەدا واتە ڕاناوی جودای کەسی سێیەمی تاکە ، (کە) یش ئامرازی (گەیەنەر) ە ( هەرچەندە من لەگەڵ زاراوەی (گەیەنەر) نیم ) . بەلاّم باوابێ تاکو جێگای خۆی دێت . (کە) بۆ زۆر شت بەکار دێت وەك « مەرج ، شی‌کردنەوە ، ڕاناوی (الذی) ی عارەبی‌و هەندێ واتای تریش » هەروەها وەك ئاوەڵکاریش دێت (ظرف زمان) . لەوانەشە لە بنەڕەتدا واوەکەی (م) بێ‌و گۆڕاوەو کراوە بە (و) . (و) یش لە کوردیدا دەبێتە (م) و بە پێچەوانەش ؛ بۆ چەسپاندنی ئەم ڕایەی دواییم ئەم دێڕە شیعرەی وەلی دیوانە دێنم :

« بەڵکم ئەو قیبلەم جەڕا گوزارێ
ڕاش گنۆ ، وەسەر کڵکۆی من جارێ »

واتا بە دووری نازانم ك (م) ی (بەڵکم) بووە بە (و) و وشەکە لە پێشەوە (بەڵکم) بووەو ئێستا بووە بە (بەڵکوو) (ب) وشەی (بەڵ) واتە بەشی دووەمی ئامرازەکە وشەیەکی عارەبی‌یە هاتووەتە نێو زمانەکەمان‌و لەبنەڕەتدا (بل) = بەڵ ) بووەو کردوومانە بە (بەڵ) ... ئەم وشەیە نادیار نی‌یەو بێ واتایش نیە

ئەم وشەیە لە عارەبی ئامێرێکی عەتفە ، کەوابوو هەبوونی (بەڵ) لەم وشەیەدا هەر بۆ دروست کردنی ئامرازەکە نی‌یە وشەی (بەڵکو) لە کوردیدا چەند واتایەك دەبەخشێو بەرانبەر بە ( عسیٰ ، لعل ، ربما ، علاوة علی ذلك ) ی عارەبی ڕادوەستی ...

« ج »ماموّستا بە ناقەناعەتەوە دەڵێ :

لەوانەیە (بەڵ) لە بەلاّم یان (بەلاّن) ەوە هاتبێت .... بەلاّم‌و بەلاّن بەرای من لە عارەبی‌یەوە وەرگیراوەو وشە ڕەسەنی‌یەکەی (ولکن) بووە ، شێوەی زمانەکەمان وای لێکردووە ، خۆ هەر ئەم وشەیە تاکە وشەیەك نی‌یە وای لێ‌بێت . شایانی باسە ئەم ئامرازە واتە (بەڵکو) لە مێژەوە بەکار هاتووەو بەچەند شێوەیەك (گۆ) دەکرێ ، بۆ نموونە مەولەوی جارێکیان بەڵکو جارێك (بەڵ) بە تەنها بەکار دێنێ ، وەلی دیوانە بە (بەڵکم) و (بەڵکو) بەکاری دێنێ . بەلاّم لە فارسی‌دا (بەڵکە) بە ( کەسرە

موختەلەسە ) بەکار دێت . هەروەها شێوە کوردیەکەی گەڕاوەتەوە بۆ زمانی عارەبی عامیانەو بووەتە : ( بەلکەم ، بەلچەت ، بەلچی ، بەلکی ، بەلکەن )

وەکو : ل / 26

أ - بەڕای مامۆستا ئامرازی (وەکو) لە دوو بەش پێکهاتووە ، لە بەشی (وە) و بەشی (کو) بەلام لەراستیدا ئەم ئامرازە ڕاستە ئامرازێکی لێکدراوەو لە دوو بەش پێکهاتووە ، بەلام نەك وەك مامۆستا دەلێ بەلکو لە (وەك) کە ئامرازی تشبیهەو (ئو) کە ڕاناوی جودای کەسی سێیەمی تاکەو لە ئەنجامی سووك کردندا هەمزەکەی سوواوەو هەر واوەکەی ماوەتەوەو وشەکە بووە بە (وەکو) ... یان لە ئامرازی (وەك) و (و) یکی زیادە کە واتای تاکیدو دلنیاکردن دەگەیەنێ پێکهاتووە . بەلگەیش بۆ ئەم ڕایە ئەوەیە کە لە توانادا هەیە هەر (وەك) بەکار بێنین و واتای وشەکە هیچی لێ نەیەت ... شایانی باسە مامۆستا خۆی لەزۆر جێگای ئەم کتێبەدا (وەك) ی بەکار هێناوە .

ب - وەك = وەکو = واتای ( مثل ، شبه ، کاف تشبیه ) ی عارەبی دەگەیەنێ و لە هەمان کاتدا بە واتای (کأنما ، کأن) ەی عارەبی دێت ئەمانەش هەر بۆ تشبیهن . بەلام (نەوەکو) نەفی وەکو نی یە وەك لە جێگای ترەوە باسی دەکەین ...

بۆ ئەوەی : ل / 27

بۆچوونەکەی مامۆستا زۆر زۆر ڕاستەو لەجێی خۆیەتی ، بەلام ئەویش دەبێ بوترێ کە زۆر جاریش هەیە (کە) یەکە دەگەڕێتەوە جێگای خۆی ، واتە زۆر جار دەوترێ ( بۆ ئەوەی کە ) و گەڕانەوەی (کە) هیچ لەواتای ڕستەکە ناگۆڕێ ...

چونکە : ل / 27

مامۆستا دەلێ : « ئەمەیان لە (چون) و ئامرازی گەیەنەر (کە) پێکهاتووە ، بە وردبوونەوە لە بەشی یەکەمی (چۆن) دەردەکەوێت ، کە لە (چۆن) ەوە هاتووە ، کە ئامرازێکی پرسیارە ، لە پاشدا پیتی (ۆ) ی بووە بە (و) و (چۆن) دروست بووە ... »

مامۆستا دەلێ (چون) لە (چۆن) ەوە هاتووە ، نازانم بەلگە بۆ ئەم قسەیە چی یە ؟ بۆ (چۆن) لە (چوون) نەبێ و هەروەها (چون) لە (چوون) ؟ چوونیش بلاوترو باوترە لە دیالێکتی جۆراو جۆری کوردیدا ، ئەویش لەبیر نەکەین کە (چوون) و (چۆن) و (چون) هەر بۆ پرسیار نی یە بەلکو بۆ چۆنیەتی واتە (تەشبیە) یش بەکاردێت ...

ئەویش دەبێ بلێین کە وشەی (چونکە) واتای (لأن) ی عارەبیش دەدا .

هەروەها بەم شێوەیەش لە فارسیدا بەکاردێت و بۆ هەمان مەبەست ..

کەچی : ل / 27

دەربارەی ئەم وشەیە دەلێ :

« ئەم ئامرازە لە ئامرازی گەیەنەر (کە) و ڕاناوی نادیاری شت (چی) پێکهاتووە ... (چی) ڕاناوێکە نادیارە . هەروا دەشتوانێ یی بە ئامرازی پرسیارو ڕستەی پرسیاری دروست بکات .. »

دەلێم : «کەچی» وشەیەکی تازەیەو لە ناوچەی سۆران بە چالاکی خۆی نواندووەو وەك بزانم یەکەمین کەسیش مامۆستا نوری عەلی ئەمین بوو کە بایەخی دایە ئەم وشەیەو لێی دواوە . لە ئەدەبی کۆندا ئەم زاراوەیە نەبووەو لە دیالێکتی جۆراو جۆری کوردیدا جگە لە دیالێکتی سۆران وەدەست ناکەوێ ... بەلام بە شێوەیەکی تر بەکار دەهێنرێت بۆ نموونە :

لە دیالێکتی کوردی خوارووی - لووڕی یە هەموو شێوەکانی - دەلێن : کەچیت : « پرتەقال لەبازار فەرەسە (کەچیت) نرخی فەرە گرانەی بە بڕوای من (چی) لێرەدا ڕاناوی نادیاری شت نی یە ، بەلکو فرمان بێ چونکە (چی) واتای (ڕۆشت = چوو) لەم دیالیکتانە دەگەیەنێ تەصریفی فرمانی (چی) یش وایە :

| | |
|---|---|
| من = چیم = چووم | ئێمە = چیـن = چوین |
| تۆ = چیت = چویت | ئێوە = چن = چوون |
| ئەو = چی = چوو | ئەوان = چن = چوون |

کەوابوو (کەچی) ڕستەیەکە بریتی یە لە (کە) ی ناوەلکرداری کاتی کە واتای (عندما) ی عارەبی دەگەیەنێ و (چی) واتای ڕۆشت یان (چوو) و تێکرای هەردوو واتای ( عندما تذهب ) ی عارەبی دەگەیەنێ و لە دیالێکتی ئەدەبی ئەمڕۆماندا هەر ئەم واتایە دەگەیەنێ بەلام وای لێهاتووە کە ببێ بە ئامراز (ئامێر) بۆ ئەم مەبەستە ...

ئەگەر : ل / 28

پوختەی بۆچوونەکەی مامۆستا :

١ — وشەیەکی لێکدراوەو لەدوو بەش پێکهاتووە واتە : لە (نە) و

گەر)

٤– بەلگەی مامۆستا ئەوەیە کە (گەر) یشی بە تەنها بەکار دێت و ...ری واش هەیە (مە) ی نەفی وەردەگرێت و (مەگەر) دروست ...دەکات .

٤– ...یتە قالبی (ئە) ش هەروەك دێتە پێش چاوی مامۆستا بۆ ...وپاتی بەکاردێت و هێزی ئەم ئامرازە زیاتر دەکات .

٥– ...لە هەندێ گۆفەرانی زمانی کوردیدا (هەگەر) یش هەیە ...ئەمە وادەگەیەنێ کە (ئە) جێگای (هە) ی گرتۆتەوە .

٤– (هە) شی لە (هەر) ەوە هاتووە وەك چۆن (هەرکە) هەیە . ...بەلام لێرەدا پیتی (ر) کەوتووەو (هە) ماوەتەوە .

٤– هەر بەم پیتەش (ئە) لە (ئەر) ەوە هاتووە پاش کەوتنی پیتی ...ر) .

–هەندێ جار (ئەر) لە بریتی (ئەگەر) بەکار دێت ئەوە لە ...دیالێکتی کرمانجی خوارووداا . هەروەها لە دیالێکتی کرمانجی ...سەروودا (ئەر) .

بەلام من دەلێم :

–(ئە) ی ئەگەر پارچەیەکە لە وشەکەو لابردنی یان مانی ...نابێتە هۆی ئەوەی کە بلێن ئەم وشەیە لێکدراوە یان بەهۆی مانی بەهێزتر دەبێ ، چونکە لابردنی ئەم پارچەیە هەر بۆ سووك کردنەو بەس هەروەها چۆن (گە) ی (گەر) لا دەبرێ ئەمیش لا ...دەبرێ .

جاری واش هەیە (ر) ی ئەگەریش لا دەبرێ ، ئەم هەموو لابردنە لە دیالێکتی جۆراو جۆری کوردیدا ، لەبۆ سووك کردن ...بێ هیچ مەبەستی تر ناگەیەنێ ، چونکە ئەم سووك کردنە لە واتای وشەکە کەم ناکاو نەشی زیاد دەکا ... واتە :

( ئەگەر ، ئەر ، گەر ، ئەگە ) بەهەر چوار شێوە یەك واتایان هەیە بەبێ کەم و زیاد .

٤– (مەگەر) ئامرازێکی سەربەخۆیەو هیچ پەیوەندیکی نی یە لەگەل (ئەگەر) دا چونکە (ئەگەر) ئامرازێکی مەرجی یەو بەرانبەر بە (اذا) ی عارەبی دەوەستێ . بەلام (مەگەر) ئامرازێکی (استثناء) بەرانبەر « ألا ، إلا ، ربما » ی عارەبی دەوەستێ ، واتە (مەگەر) نەفی ی (ئەگەر) نی یە . ئەمە لە لایەك و لە لایەکی ترەوە (مە) لە کوردیدا ئامرازی (نەفی) نی یە بەلکو (نەهی) بێ و لەگەل فرمانی داخوازی دێت ( مەچۆ ، مەکە ، مەبە ، هتد ... )

3– هەمزە لە کوردیدا جێگای (هـ) دەگرێ و بە پێچەوانەش راستە ، بۆ نموونە هەور = ئەور ، ئەلگرت = هەلگرت ئەنجیر = هەنجیر ، هامراز = ئامراز ... واتە فۆنیمی (هـ) ە دەبێتە وێنە بۆ فۆنیمی (ء) ەو فۆنیمی (ء) ەو دەبێتە وێنە بۆ فۆنیمی (هـ) ە

4– (هە) لە (هەر) ەوە نەهاتووە چونکە (هەر) وشەیەکی سەربەخۆیەو بەرانبەر بە ( کل ، ایّ ) ی عارەبی دەوەستێ هەروەها (ئە) لە (ئەر) ەوە نەهاتووە چونکە ئەگەر (ر) ی (ئەر) بکەوێ واتاکەی نامێنێ .

**بەشی سێیەمی کتیبەکە :**

---

مامۆستا ئەم بەشە ئەکا بە سێ لق :

**1– لقی یەکەم** : زاراوەی ( پەیوەستدار ) ل / 34

پوختەی باسەکەی :

أ ـ دوای دەربڕینی نارەزایی خۆی دەربارەی ئەو زاراوانەی کە لە هەندێ کتێبە ڕێزمانی یەکانی کوردی بەکار هاتوون دەلێ :

« ئێمە لەم کارەدا بە باشی دەزانین . کە زاراوەی (پەیوەستدار) بەکار بهێنین ، چونکە ئەم ئامرازانە پەیوەستی لە نێوان دوو ڕستەدا پەیدا دەکەن ، بەمەوە توانای پەیوەستیان هەیە ، لەبەر ئەوە ناویان دەبەین بە ئامرازی پەیوەستدار . »

ب ـ وشەی پەیوەستدار لە دوو بەش پێکهاتووە لە بەشی (پەیوەست) و بەشی (دار) . پەیوەست بە واتای پەیوەندی بەکار دەهێنرێت .

بەشی (دار) ئامرازێکە بۆ دروست کردنی ناوی دارێژراو بەکار دەهێنرێت هەروەك ( سەردار ، عیلمدار ، زامدار ، خەزنەدار .

ح ـ ئەم ئامرازە (دار) واتای هەبوون دەگەیەنێ ، کە (دارد) ی فارسی دەگرێتەوە .

ء ـ واتای تێکڕای ئامرازەکە « ئامرازی پەیوەست هەبێ »

1– بەڕای من ئەگەر ئەم ئامرازانە وەك مامۆستا دەلێ پەیوەستی لە نێوان دوو ڕستەدا پەیدا دەکەن ئەبوایە ناویان بە ئامرازی ( پەیوەستدەر ) ببردایە نەك ( پەیوەستدار ) چونکە ڕستە لێکدراوەکە ( پەیوەستدارە ) و ئامرازەکە پەیوەستدەرە .

واتە ڕستەکە ئامرازی پەیوەستدەری هەیە بۆیە پەیوەستدار دەبێ ... ئەویش دەبێ بوترێ کە مامۆستا خۆی لە زۆر جێگا ( ڕستەی لێکدراوی پەیوەستدار ) ی بەکارهێناوە کەچی بە ئامرازەکەیش دەڵێ ئامرازی پەیوەستدار .

ب - دەڵێ (دار) ئامرازێکە بۆ دروست کردنی ناوی داڕێژراو بەکار دەهێنرێت وەك ( سەردار ..... ) ئەم ڕایەی مامۆستا ڕاست نی‌یە چونکە (دار) ناوی داڕێژراو دروست ناکا بەڵکو ئاوەڵناوی داڕێژراو دروست دەکات .

چونکە ( سەردار ، عیلمدار ، زامدار ... ) ئاوەڵناون واتە (اسم فاعل) ی عارەبی دەگەیەنن ئیتر چۆن ناوی داڕێژراو دروست دەکەن ؟!

ج - (دار) واتای هەبوون ناگەیەنێ چونکە (هەبوون) چاووگەو چاووگی (دار) (داشتن) ە ، هەروەها نە (دار) و نە (هەبوون) واتای (دارد) ی فارسی ناگرێتەوە چونکە (دارد) بەرانبەر بە (هەیەتی) دەوەستێ ، ئەویش لەبیر نەکەین کە (دار) چاوگی (داشتن) ەو واتای (خاوەن) دەداو لە عارەبی بەرانبەر بە (صاحب ، مالك) ە

ء - ئیتر کەوابوو دەبێ واتای تێکڕای ئامرازەکە ئامرازێکی توانای (پەیوەست) هەبێ ....

2 -لقی دوو : لەم لقەدا باسی جۆرەکانی ئامرازی سینتاکسی (پەیوەستدار) دەکاو دەیانکاتە چوار بەشەوە جا باسی بەشەکان یەکە یەکە دەکا .

منیش چەند سرنجێکم هەیە دەربارەی بۆچوونەکەی مامۆستا وا لێرەدا باسیان دەکەم ...

أ - کە باسی ئامرازی پێکەوە بەستنەوەی (و) دەکا ئەم نموونەیەی خوارەوە دێنێ :

« تۆ هەتە تیغی دەبان‌و من هەمە تیغی زبان »

ئینجا دەڵێ :

« لەم ڕستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا دوو فاعیل هەیە لەگەڵ دوو فیعل ، یانی بۆ هەر ڕستە سادەیەك فاعیل‌و فیعلی خۆی هەیە . »

تا ئێرە قسەکەی ڕاستەو هیچ ڕەخنەیەکم نی‌یە . بەڵام کە لەسەر قسەکەی خۆی دەڕواو دەڵێ : « دەشبێ بۆ هەردوو ڕستەکە یەك فاعیل هەبێ‌و دوو فیعل . بۆ نموونە : ئافرەتێکی سەرە دڵی لەرزێ‌و ڕەنگی زەرد هەڵگەڕا . (ل / 35) . وا دەر دەکەوێ کە مامۆستا فرێزی (ئافرەتێکی سەرە بە فاعیلی هەردوو فیعلەکە دەزانێ ، ئەگەر وانەبێ نالێ :

یەك فاعیل‌و دوو فیعل » . وادیارە کە مامۆستا وشەی (دڵ) بە فاعیلی فرمانی (لەرزی) دانانێ . هەروەها وشەی (ڕەنگ) بە فاعیلی فرمانی (زەرد هەڵگەڕا) ناژمێرێ !... (ب) لە لاپەڕە (36—38) دا باسی ئامرازی پێکەوە بەستنی (ش) دەکا . بەڵام لە هەموو نموونەکانی هەر باسی (یش) دەکاو نالێ ئەو (ی) یە چی‌یەو ئەرکی لەگەڵ ئەم ئامرازەدا چی‌یە ؟ ...

ئەگەر ئامرازەکە تەنها (ش) بێ ئەی بۆ نموونەی بۆ نەهێناوەو ئەگەر (یش) بێ ئەی بۆ نموونە بۆ (ش) نەهێناوە ؟ ...

بەڕای من : ئامرازەکە لە دیالێکتی ئیمڕۆماندا (ش) ە بەڵام ئەو (ی) یە ئەرکی ئەوەیە کە نەکونجان نەهێڵێ لە نێوانی فۆنیمی کونسۆنانتی وشەکەو (ش) ی ئامراز . بۆیە دەبینین کە ئەگەر کۆتایی وشەکە بزوێن بوو (ی) کە نامێنێ واتە لادەبردرێ :

« ئەوەش ئەمەش » ، واتە (ی) کە بۆ (وقایە) یە ... لە هەندێ دیالێکتی کوردی‌دا (یش) ئامرازەکەیە بۆیە دەبینین (ی) کە لانابردرێ‌و دەڵێن : (ئەویش ، ئەمەیش) ، کەوابوو دەتوانین ئەم ئامرازە بە دوو شێوە دابنێن ...

(ج) لە لاپەڕە (37) دا کە باسی فیعل‌و ڕستەکان دەکا ئەم نموونەی خوارەوە دێنێ :

ئەویان بە کولێنگ ئەرزی ئەکۆڵی ، منیش بە خاکەناز خۆڵەکەم دەر ئەدا .

دەڵێ :

« لەم ڕستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا بۆ هەر ڕستەیە فاعیلی تایبەتی هەیە ، ڕستەی یەکەم ووشەی « ئەویان » کە ڕاناوی جودای کەسی سێیەمی تاکە فاعیلی ڕستەکەیە . لەهی دووەمدا ووشەی (من) کە ڕاناوی جودای کەسی یەکەمی تاکە فاعیلی ڕستەکەیە . » ئەو دەڵێ (ئەویان) ڕاناوی جودای کەسی سێیەمی تاکە !! بەڵام من دەپرسم ئایا (ئەویان) یەك ڕاناوە یا دوو ڕاناو ؟ . هەڵەکە وا ڕوونە پێویستی بەلێ دوان ناکا .

ئەمە لە لایەك‌و لە لایەکی ترەوە دەڵێ : فاعیلی ڕستەی دووەم (من) ە ئایا ئەمە ڕاستە ؟ . ئەگەر ڕاست بێ ئەی ئەرکی (م) ی ( خۆڵەکەم دەر ئەدا ) چی‌یە ؟. لەهەمان کاتدا ئەرکی (ی) ی

ـكوی لە (ئەرزی ئەكۆلێ ) چی‌یە ؟!. ئایا دەبێ لەم دوو ڕستەدا چوار فاعیل بۆ دوو فیعل هەبێ ؟!

ە ـ لە لاپەڕە (٣٨) دا دەربارەی ئامرازی (عەتف) دەڵێ :

« لێرەدا هەر ئامرازی « بەلام» هەیە ، کە دەتوانێ ڕۆڵی عەتف) بگەیەنێ ، ئەم جۆرە بۆ زۆر ئامراز ناوبراوە کە هەموو ئـمرازەکانی پەیوەستدار دەگرێتەوە . »

هەموو دەزانین کە وشەی (عەتف) عارەبی‌یەو لەوێ وەرمان گرتووە ، عەتفیش وەك ئەوان تەعریفی دەکەن ئەمەیە :

ووشەیەك یا فریزێك یان ڕستەیەك بەهۆی ئامـرازێکی عەتف بەشوێن ئەوەی پێشەوەی دەکەوێ ، چ ووشەبێ ، یا فریز ، یان ڕستە ..

کەوابوو ئەو بەڕێزانەی کە زۆربەی ئەو ئامرازانە بە ئامرازی عەتفیان داناوە لەسەر ڕێگای ڕاستەوە ڕۆشتوون ، بەلام دکتور لێرەدا هەر (بەلام) بە ئامرازی عەتف دەژمێرێ‌و ناڵێ مەبەست لە (عەتف) چی‌یەو چۆنی لێکدەداتەوە !!

هـ ـ لە لاپەڕە (٣٩) دا دەڵێ :

« ڕستـەی لێکدراوی پەیـوەستدار بـە یارمـەتی ئـامـرازی پەیوەستداری عەتف (بەلام) دەبێ لە دوو موبتەدا یان فاعیل پێکهاتبێ ، ئەمەش بە زۆری بەرچاو دەکەوێت ، بۆ نموونە :

دەمم هەڵ هێنایەوە وەرام بدەمەوە بەلام .

تەپە تەپی پێ‌ی وەستاو وەستا ژنم دەم کوتی کردم . لەم ڕستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا فاعیلی ڕستەی یەکەم (م) .

کە ڕاناوی لکاوی کەسی یەکەمی تاکە ، فاعیلی ڕستەی دووەم کۆمەڵە فاعیل « تەپە تەپی پێ‌ی وەستاو وەستا ژنم » .

لەم قسەی مامۆستا دەردەکەوێ کە هیچ جیاوازی‌یەکی ئەوتۆ نی‌یە لە نێوانی (فاعیل) و (موبتەدا) دا ، ئایا ئەمە هەڵە نی‌یە ؟ ئەمە لە لایەك‌و لە لایەکی ترەوە دەڵێ : فاعیلی ڕستەی یەکەم (م) ە بەلام ئەگەر سەیری ڕستەی یەکەم بکەین دەبینین ئەم ڕستەیە بریتی یە لە دوو ڕستـەی سادە واتـە : ( دەمم هەل هێنـایەوە ) و ، ( وەرام بـدەمەوە ) . جـا نازانم مـەبەستی مامۆستا کام (م) ە ئایا میمی (دەمم) یان (م) ی ( بدەمەوە ) . ئەگەر یەکەم بێ ئەی ئەرکی دووەم چی‌یەو ئەگەر دووەم بێ ئەی فاعیلی فیعلی (هێنا) کامەیە خۆ هەرگیز میمی (دەمم) نی‌یە ، تۆ بڵێ‌ی مەبەستی مامۆستا میمی (دەمم) بێ کە ئەگەڕێتەوە بۆ قسەکەر واتە مادام قسەکـەر یەکێکـە هەر خـۆی فاعیلەو موبتەدایە با هەزار فیعلی جۆراو جۆر لە قسەکەی‌دا بێ ؟؟

هەروەها ئەگەر کـۆمەڵە فـاعیلی « تـەپە تـەپی پێ‌ی وەستاو وەسـتـاژنم » فاعیـلی ڕستەی دووەم بێ ئـەی ئـەرکی (و) ی پـیـوەستدەری نێـوانی (وەستا) و ( وەستـا ژنم ) چی‌یـەو ئەرکی ڕاناوی (ی) ی ( دەم کوتی کردم ) چی‌یە ؟!...

و ـ ئامرازی پەیوە ستداری هامبەری (ل / ٤١ ـ ٤٢) لێرەدا مامۆستا باسی (ئەوسا) دەکاو من بە فراوانی باسی ئەم ئامرازەم کرد بەلام ئەوەی سەرنج ڕاکێشەربێ . لەم باسەدا ئەوەیە کە دەڵێ :

« لەم ڕستەیەدا ـ مەبەست ڕستەی ( پشویەکمدا ، ئەوسـا ڕوانیمە دەورووپشتم ) ـ ئامرازی ئەوسا ، توانیویەتی . کـە هەردوو ڕستەکانی ( پشویەکمدا ) ، ( ڕوانیمە دەورو پشتم ) بە یەکەوە ببەستیتەوە ئەم ڕستانە یەك موبتەدایان هەیەو دوو خەبەر کە فرمانەکانیان لە کاتی ڕابردوون . »

ئەگەر باسەکە باسی ڕێزمانی عارەبی بێ خۆ ئەوە لەم ڕێزمانەدا موبتەداو خـەبەر دوو زاراوەی ڕێـزمانـین‌و هەریـەکە یـاساو سنووری خۆی هەیە هەروەها لەم ڕیزمانەدا هەر موبتەدایەك یەك خەبەری هەیەو هەرگیز موبتەدا نابیتە فاعیل‌و فاعیلیش نابێتە (موبتەدا) ئیتر چۆن یەك موبتەداو دوو خەبەر ؟

ئەگەر باس باسی ڕێـزمانی کـوردی بێ خۆم لەم ڕێـزمانـەدا موتبەداو خەبەری عارەبی ناگونجێ لەگەڵ ڕێزمانەکە چـونکە هەموو ڕستەیەك وەك زانایان دەڵێن دەبێ فرمانی هەبێ واتە زاراوەی ( جملة اسمیه ) ی عارەبی لە کوردیدا نی‌یـە تاکـو موبتەداو خەبەر هەبێ .!!.

جا دەگەڕێمەوە سەر قسەکەی پێشووم‌و دەڵێم دیارە مامۆستا موبتەدا لە فاعیل جودا ناکاتەوەو ، هەروەها فرمان لە خەبەر جودا ناکاتەوە ، وا دەردەکەوێ کە ئەگەر پێنج فرمانمان هەبێ‌و هەر پێنیجی یەك شێوە ڕاناوی لکاوی‌یان لەگەڵ دابێ ئەوە هەر پێنج فرمانەکە خەبەرن‌و یەك موبتەدایان یاخود یەك فاعیلیان هەیە واتە ئەگەر وتمان :

« خواردم ، نووستم ، هـاتم ، بردم ، گـەڕامەوە » ئـەم پێنج ڕستەیە پێنج خەبەرن‌و یەك (موبتەدا) یـان فاعیلیـان هەیـە ئەویش (م) ە کەیە ؟!! ئایا ئەمە لە چ ڕیزمانێك هەیەو ڕووی داوە ؟!

هـ ـ لە خاڵی دووەمی بەشی سێ‌یەمی کتێبەکەی‌دا ، مامۆستا

ئامرازەکانی سینتاکی پەیوەستدار لە زمانی ئەدەبی کوردیدا دەکاتە چوار بەشــەوە : « پێکەوە بــەستنەوە ، عــەتف ، لێك جیاکەرەوە ، هامبەریی‌یەك »

( براونە ل / ٢٤ ) جا دەکەوێتە باس کردنی بەشە ناوبراوەکان ، لە بەشی یەکەم باسی (و ، ش) ولە بەشی دووەم باسی (بەلام) و سێیەم (یا) و چوارەم (ئەوسا) دەکات . ئینجا دەڵێ « هەندێ ئامرازی تری سینتاکسی پــەیوەستــدار هەن نــاچنە پــاڵ ئەو بەشانەی سەرەوە ، بەلام لەگەڵ ئەوەشدا ئامرازی سینتاکسی پەیوەستدارن »

ئەمانەی ناچنە پاڵ ئەو چوار بەشەوە (نۆ) ئامرازن :

( یا ... یا ، بەلکو ، وەکو ، نەوەکو ، ئینجا ، ئەگینا ، وە ، ئێستا ، فارزە ) . شایانی باســە (یا ... یــا) و ( فارزە) لە لیستــەی ئامرازە سینتاکسیەکانی لاپەڕە (٢٥) دا تۆمار نەکراون .

ئالێرەدا پرسیارێك دێتە کایەوە . ئایا ئەم نۆ ئامرازە کە ناچنە ژێر ئــەو دابەش کــردنەوەی ئــامرازە سینتــاکسیەکــان واتــە نــە (بــەستنەوە) و نــە (عەتف) و نــە ( لێك جیــاکەرەوە ) و نــە ( هامبەریی‌یەك ) ن ئەی گوایا چین ، مەگەر مامۆستا خۆی نالێ ، هەریەکە لە ئەمانە دوو ڕستە بە یەکەوە دەبەستێتەوە ، ئیتر بۆچی لەگەڵ بەشی یەکەمدا باسیانی نەکرد ؟!... جا بابزانین دەربارەی ئەم نۆ ئامرازە چی دەڵێ :

1 — (یا ... یا) : ل / 43

مامۆستا دەڵێ : « ئەم ئامرازە یەکێکە لە ئامرازەکانی سینتاکسی پەیوەستدار ، کە دوو ڕستە بە یەکەوە دەبەستێتەوەو واتــای هەڵبژاردن (إختبــار) دەگەیــەنێ ، هەنــدێ جاری تــر واتای ئیمتحان دەگەیەنێ » جا ئەم (یا ... یا) یە چ جیاوازی‌یەکی هەیە لەگەڵ ئەو (یا) یەی کە لە لاپەڕە (41) دا باس‌کرا لەژێر ناونیشانی ، ئامرازی پەیوەستداری جیاکەرەوە ؟.

بەش بە حاڵی خۆم هیچ جیاوازی یەك نابینم لە نێوانی ئەم‌وئەو تەنها ئەوە نەبێ ئەمیان دووپاتی ئەوەو دووپات‌کردن یا سێو چوار جار دووبارە کردنی ئامرازێك نابێتە هۆی ئەوەی بڵێین دوو ئامرازی جیاوازن ، هەروەهــا ئەگــەر (یا) واتــای جیاکــردن دەگەیەنێ لە هەمان کاتیش‌دا دەتوانێ دەوری (اختیار) واتە هەڵبژاردنەوەش ببینێ بۆ نموونە « کامیان حەز لێ دەکەی ببیە ئەمە یا ئەوە . »

ـ «ئارەزووی خۆتە بیخۆرەوە یا مەخۆرەوە . » هتد ...

ئەمە لێرەدا هەڵبژاردن نی‌یە

2 — بەلکو : ل / 43 — 44

لەمەوپێش باسی ئەم ئامرازە بە فــراوانی کرا ، بــەلام ئەوەی سرنج ڕاکیشەربێ ئەوەیە کە مامۆستا ئەم نموونەی خوارەوە دێنێ :

( من قوتابخــانەی شــارەکەمــانم تەواو کــرد ، لە زانستگای بەغداش دەرچووم ، بەوەش نەوەستام ، بــەڵکو کــۆتاییم بــە زانستگایەکی ئەورووپاش هینا . )

ئینجا دەڵێ :

« لەم ڕستە لێکدراوە پەیوەستدارەدا ، کە بە یارمــەتی ئامرازی (بەلکو) ، بە یەکەوە بەستراونەتەوە یەك مــوبتەدا ـ فاعیل ـ هەیە » جا نازانم ئەو یەك موبتەدا یان فاعیلە کامەیە (من) ە یا (م) ی (قوتابخانەی شارەکەمانم تــەواو کرد یــان (م) ی (دەرچووم) ، یا (م) ی ( نەوەستاوم ) یاخود (م) ی ( کۆتایم هینایە ) .

3 — (وەکو) ل / 45 — 46

لە لاپەڕەکانی پێشودا باسی ئەم ئامرازەم بەفــراوانی کردو لە ئەنجامدا وتم ئەم ئامرازە بریتی‌یە لە (وەك) + (ئو) بەلام لە باسەکە مامۆستادا شتێکی تازە هەیە ، ئەوەیە کە دەڵێ :

« ئــامرازی (وەکــو) جاری‌وا هــەیە کــە ئامــرازی نەفی (نــە) وەردەگرێت بۆ نموونە : شارەکەی ئێمەش خۆی ئامادە ئەکرد (نەوەکو) ڕۆژێ لە ڕۆژان جەنگ بکەوێتە لای ئێمەشەوە . » ئەگەر (وەکو) فرمان بێ ئەوە بۆمان هەیە بڵێین ئامرازی نەفی وەردەگرێت چونکە هەر فرمانی نەفی دەکرێ ، ئــەویش دەبێ ئەگەر (وەکو) ئاوڵناو بێ بڵێین چونکە ئاوڵناوە بەهۆی پێشگری (نــە) بوو بــە ئاوەڵنــاوێکی تر هــەروەك نەخــۆش ، نــەمــر ، نەخوێنەوار ، نەزان هتد ...

بەلام ئەم وشەیە واتە (وەکو) نەفرمانەو نــە ئاوڵنــاوە بەلکــو ئامرازێکە بۆ تشبیهو تاکیــد بەکــار دەهێنرێت‌و بــەرانبەر بــە (مثل) ی عارەبی . ئەویش دەبێ (نە) کە بکەوێتــە پێشەوەی بەلام بە واتای (لیس مثل) ی عارەبی بەکار بهێنرێت وەك ئەم نموونەی خوارەوە : تۆ دەبێ چالاك بیت نەوەکو ئازاد ...

ئالێرەدا (نە) کە نەفی فرمانی لابراو دەکات کە (بیت) ە واتە نەفی (وەکو) ناکات ...

ـەویش لەیاد نەکەین کە (وەکو) لە (وەك + و) پێکهاتووە ...
ـەگەر بێینە سەر (نەوەکو) دەبینین واتای (لیس ، مثـل) نادا ـەکو واتای (لەترسی ئـەوە) دەداو واتە : ئـەم زاراوە واتای حذراً ، خوفاً) عارەبی دەگەیەنێ واتە بۆ ئاگادار کردن و وریا کردنە لە ڕووداوێك دا کە لە پێشەوە ڕووی داوە یان لە داهاتوودا ـوودەدا . کەوابوو دەبێ بگەڕێین تاکو بزانین چۆن ئەم زاراوە ـخود ئەم ئامرازە دروست بووە؟!. بەرای من ئەم ئامرازە لە سێ ـەش پێکهاتووە : (نە + وە + کو) ، (نە) ئامرازێکە بۆ نەفی ـەکاردێت ئەوە گومانی تێدا نی یە ، (کو) یش لە (کە) وە هاتووە ـەی (وە) لەچی یەوە هاتوە ؟ . بـۆ وەڵامدانی ئەم پـرسیارە ـەبێ گەشتێك بکەینە نێوانی دیالێکتی جۆراو جۆری کوردی چونکە زمانی ئەدەبی ئیمڕۆمان نەپچڕاوە لە دیـالێکتی جۆراو جۆرەکان و بۆیە دەڵێم : لە دیالێکتی لوڕی و هەروەها لە دیالێکتی هەورامی وشە (نەوا نەبا) هەیە کە بۆ هەمان مەبەس بەکار ـێت هەروەها لە زمانی فارسی (مەبادا) هەیە بەهەمان واتا . (نەبا) لە دوو بەش پێکهاتـووەو (نەوا) یش هـەروەها بـەڵام (ب) ی (نەبا) بووە بە (و) لە وشەی (نەوا) . (با) و (باد) وەك فارسەکان دەڵێن لە (باشد ، بوودن ، هاتووە واتە (بوون) ەوە هاتووە . کەوا بوو (با = وا = باد) ڕەگی فرمانن بۆیە نەفی دەکرێن .

تێکڕای وشەکە واتای (كي لايكون) ی عارەبی دەگەیەنی واتە (بۆ ئەوەی کە نەبی) یا لە ترسی ئەوەی کە )
واتە : (نەوەکو) کورت کراوەی (نەباکو = نـەواکو) یـەو لە هەمان کاتدا واتای (نەواکە) دەدا یاخود (نەباکە) .
وەك دەردەکەوێ کە ئەم وشەیە زۆر دوورە لە وشەی (وەکو) هەرچەندە لە لایەنی نووسینەکەی پارچەیەکی لە (وەکـو) دا دەچێ :

**نموونەی لوڕی :**

**بەو تا بنێمن دوو دەس لە گەردەن**
**(نەوا) لە ئاکام پەیدا بوو مەردەن**
**«فۆلکلۆر»**

**نموونەی هەورامی :**

**(نەوا) بۆ چی نەوازا مەن دوورم**
**(دیوانە) م بەندەی مەولای (ڕەنجور) م**
**(وەلی دیوانە)**

4 — ئینجا : ل / 47

لە لیستەی ئامرازەکاندا کە لە لاپەڕە (20) دا تۆمار کراوە ئەم ئامرازە بە ئامرازێکی (سادە) لە قەڵەم دراوە .
لەڕاستی دا ئەمە ئامرازێکی لێکدراوەو لە دوو پارچە پێکهاتووە یەکەمین (ئین) ەو دووەمین (جا) یە ، ئین ڕاناوێکی نیشاندەرەو لە کۆنەوە بەکار هاتووەو جارجاریش کـورت دەکرێ و دەبێتـە (ئی) و هەروەها جـار جاریش (ن) ەکـەی دەبێتە (م) واتـە وشەکە دەبێتە ئیم وەك ( ئیمڕۆ ، ئیمجا ، ئیجا ، ئیسە هتد ... )
(جا) کورت کراوەی (جار) ەو جاریش واتای ( هاوار ، بانگ ، تاو ، گل ) و بەرانبەر بە ( صرخە ، نوبە ، کرّە ، دفعە ، تارە ، ی عارەبی دەوەستێ ، تێکڕای وشە لێکدراوەکە واتای (ئەم جار) دەگەیەنێ یاخود (هذه المرە) ی عارەبی .
لە دیالێکتی جۆراو جۆری کوردی بەم شێوەی خوارەوە بەکار دەهێنرێت : ئیجار ، ئیجا ، ئینجا ، ئیمجار ، ئیمجا ،

5 — ئەگینا ل / 47 — 48
ئەم ئامرازەیش لە لایەنی مـامۆستـادا بە ئـامرازێکی سـادە دانراوە .
( بڕوانە لاپەڕە 25 )
لە ڕاستی دا ئەم ئامرازە لە دوو بەش پێکهاتووە ، لە (ئەگەی) و (نا) واتە : ئەم ئامـرازە لێکدراوەو سـادە نی یە (ئـەگەی) لە گومانی خۆم لە بنەڕەتـدا (ئەگـەر) بووە هـەڵەی زمانی وای لێکردووەو زۆر جار هەیە هەڵەی زمانی دەبێتە هۆی فـراوان کردنی زمان نەك هەر لە کوردیدا بەڵکو لە زۆربەی زمانەکانی جیهان دا . (نا) یش پاشگرێکە واتای (پێچەوانە) دەداو تێکڕای وشەکە واتای ( وان لا ، اذا لا ) ی عارەبی دەگەیەنێ
6 — ئێستا : ل / 49
مامۆستا ئەم ئامرازەیش سادە دادەنێ و لە ڕاستی دا ئەمەیش لێکدراوەو لە دوو بەش پێکهاتووە یـەکەم (ئێ) کـە ڕاناوێکی نیشاندەر بۆ نزدیك و دووەم : (ستا) یەکە دەستکاری کراوی وشـە (سەعـات) ەو واتای کـات دەداو تێکڕای وشـەکە وان (الآن) ی عارەبی دەگەیەنێ ...
7 — فارزە / ل / 49 — 50
دەربارەی (فارزە) ەوە دەڵێ

« ڕستەی لێکدراوی پەیوەستدار ، جاری وا هەیە دروست دەبێ بەبێ هەبوونی ئامرازی پەیوەستدار ، لێرەدا تەنها بە (کوما) = (فارزە) «،» بەیەکەوە دەبەسرێنەوە . »
لەڕاستیدا فارزە نیشانەی تەواو بوونی ڕستەیەو دەبێتە هۆی ئەوەی مرۆڤ تۆزێ ڕاوەستێ لە کاتی قسە کردنداو هەرگیز دوو ڕستە بەیەکە نابەستێ . باشتر وابوو (:) دوو خاڵی بکردایە بە ئامرازی پەیوەستدەر ( پەیوەستدار ) چونکە ئەم دوو خاڵە دەبێتە هۆی بەیەکەوە بەستنی ڕستەی دووەم تەواوکەری قسەی یەکەمە وەك لەم نموونەیە دەردەکەوێ :
« ماموستا وتی : سبەینێ بەشی دووەمتان پێ دەڵێم » بەشی چوارەم ئامرازی سینتاکسی گەیەنەر ل / 51 — 75 ئەم بەشە کراوە بە دوو لقەوە ، لقی یەکەم باسی زاراوەی گەیەنەر دەکاو لقی دووەم باسی ئامرازەکانی گەیەنەر دەکا .
من لەم بەشەدا چەند خاڵێکم هەیە ، :

1 — لە لقی یەکەمدا ماموستا دەڵێ : ئەم زاراوە لە لایەنی ڕێزمان نووسانی کوردەوە بەکار نەهاتووە بەلام تەنها لە لای ماموستا حەسەن ئەحمەدەوە بەکار هاتووە لەڕاستیدا ئەم زاراوە بۆ یەکەمین جار لە لایەن ماموستا نوری عەلی ئەمین بەکار هاتووە لە ساڵی ـ 1960 و مەبەستی لەوە ( اسم الموصول ) ی عارەبی بوو هەرچەندە (گەیەنەر) واتای (اسم الموصول) ی عارەبی نادا

2 — لە لاپەرە (72) دا کە باسی ( ئەگەر دەکا دەڵێ : « ئامرازی گەیەنەر (ئەگەر) لە زمانی کوردیدا ڕواڵەتی تریشی هەیە ، وەك ( گەر ، مەگەر ، ئەگەرچی ) هەرسێ حاڵەتەکە لە بریتی ئەگەر بەکار هاتوون . هەروەها ئەم سێ نموونەیەی هێناوە :

* ژنی بەد ژەنگی ژیانە ـ (گەر) خوێتی لێدەی ماڵت وێرانە
.
* ڕێوی بەفێل ناوەستێ ـ مەگەر تەڵە بی بەستێ .
* باشیش نیە ئەم قسانە ئەکەم (ئەگەرچی) لە دڵی خۆشما بێت . »

(ئەگەر بەدوو شێوەی تر دەوترێ ئەوانەش (گەر) (ئەر) ئەو هەردوو شێوە بریتین لە کورت کراوەی (ئەگەر) بۆیە (ئەر) و (گەر) لە بریتی (ئەگەر) بەکاردێن . بەلام (مەگەر) هەرگیز لە بریتی (ئەگەر) بەکار نەهاتووەو ناهێنرێت چونکە (مەگەر) واتای گومان و بڕوا بەدەست دەداو بەرانبەر بە ( ربما ، لعلّ ، الا اذا ) ی عارەبی دەوەستێ لە کاتێکدا (ئەگەر) واتای ئامرازێکی مەرجییەو ئەگەر هاتوو (مەگەر) مان خستە جێگای (ئەگەر) واتای ڕستەکە دەگۆڕدرێ وەك لەم دوو نموونەی خوارەوەدا دیارە :

« ڕێوی بەفێل ناوەستێ (مەگەر) تەڵە بی بەستێ »
« ڕێوی بەفێل ناوەستێ (ئەگەر) تەڵە بی بەستێ »

وەك دەبینین واتای ڕستەی دووەم زۆر جیاوازە لە واتای ڕستەی یەکەمەوە ، واتە واتای ڕستەی دووەم بە پێچەوانەی ڕستەی یەکەمە ...
هەروەها (ئەگەرچی) جێگای (ئەگەر) ناگرێ و مەبەستەکەی نادا چونکە ئامرازی (ئەگەرچی) واتای بێ گومان ، هەرچەندە )بەدەست دەدا واتە بەرانبەرە ( ولو ان ، مع ان ، لاشك )ەی عارەبی دەگەیەنێ ... لە کاتێکدا (ئەگەر) وەك وتمان هەر بۆ مەرجە ...

3 — بۆیە ل / 74
ماموستا ئەم ئامرازە بە ئامرازێکی سادەی داناوە ( ل / 25) لەڕاستیدا ئەم ئامرازە ئامرازێکی لێکدراوەو لە دوو بەش پێکهاتووە بەشی یەکەم (بۆ) یە واتاکە ڕوونە پێویست بە شیکردنەوە ناکا .
بەشی دووەم (یە) یە ئەمیش ڕاناوێکی نیشاندەرە بۆ نزدیك واتای (ئەمە) دەگەیەنێ و تێکڕای وشەکە (بۆ ئەمە) بەرانبەر بە (لهذا) ی عارەبی ... وە بۆ ئاگاداری (بە) لە لوڕی و لە هەورامی زۆر باو بلاوە بۆ نموونە :

(یە) کردەی کێ بی — کردەی نەگری کوو
نەگری لە بلوش — وێنەی ڕوولەی نوو
« لوڕی ـ فۆلکلۆر »
بە دوود منەن — دنیا گرت نەوەر
بە سوز منەن — سوزان دەشت و دەر
« وەلی دیوانە » .

بائیز عمر احمد




- «را» لە زمانی کوردیدا وەکو نیشانەی کاتی ڕابوردووی فرمانی بکەری شاراوە (پاسیف ـ مبنی للمجهول) دێت ، کە تەنیا دەچێتە سەر چاوگی تێپەڕ . بەم جۆرە :ـ

أ ـ نیشانەکە لە چاوگی (واوی)دا تەنیا دەچێتە سەر ڕەگی ڕابوردوو . وەکو :ـ دروون ـ درووڕا .
گروون ـ گرووڕا .

ب ـ لە چاوگی [دالیو «ا»و تاییو «ن»]دا دەچێتە سەر ڕەگی ڕابوردووو هەندێجار ڕەگی ئێستا . وەکو :ـ
بیستن ـ بیسترا ـ بیسرا
دیتن ـ دیترا ـ ×
گوتن (ووتن) ـ گوترا (ووترا) ـ ×
بردن ـ بردرا ـ بررا
خوێندن ـ خوێندرا ـ خوێنرا

ج ـ لە چاوگی (ئەلفیو یایی ـ وە هەروەها ئەو چاوگانەی کە بە «اندن» کۆتایی دێن) تەنیا دەچێتە سەر ڕەگی ئێستا . وەکو :ـ
پێوان ـ پێورا
کێلان ـ کێلرا
گوشین ـ گوشرا
بینین ـ بینرا
خنکاندن ـ خنکێنرا
شکاندن ـ شکێنرا

وە هەروەها لە چاوگی داڕێژراوو لێکدراوی تێپەڕیش ئەم جۆرە فرمانە دروست دەکرێ .

بەلام لە کرمانجی ژوروودا دەبێتە :ـ
ئەز هاتمە دیتن . (ئەز هاتم دیتن .)
ئەز هاتمە خاندن . (ئەز هاتم خاندن .)
بەم جۆرە :ـ أ ـ بەرکار .
ب ـ هات + کۆتایی کەسی بۆ بەرکار بە پێی کەس و ژمارە + [ە] .
ج ـ چاوگی فرمانەکە .

ئەمە بۆ ڕابوردوو ، بۆ ئێستاو داهاتوو دەبێتە :ـ
ئەز د هێمە دیتن . (ئەز د هێم دیتن .)
ئەز دێ هێمە دیتن . (ئەز دێ هێم دیتن .)
بەم جۆرە :ـ أ ـ بەرکار .
ب ـ نیشانەی کاتی ئێستا «د» یا داهاتوو «دێ» .
ج ـ ڕەگی ئێستای (هاتن) کە (هێ) یە + کۆتایی کەسی بۆ بەرکار بە پێی کەس و ژمارە + [ە] .
د ـ چاوگی فرمانەکە .

لە هەندێ ناوچەی ئەم دایالێکتەدا ، ڕەگی ئێستای (هاتن) کە (هێ)یە فۆنیمی (هـ) دەگۆڕێ بە دەنگی (ئ) .
وەك :ـ ئەز د ئێمە دیتن . (ئەز دئێم دیتن .)
وە هەندێ جار ئەو فۆنیمە (هـ) فڕێ دەدرێ لە کاتی ئێستادا نەك داهاتوو ، کە ئەمە وای لێ دەکا نیشانەی کاتی

ئێستا (د) ،،به هۆی فۆنیمی (ێ) ی (هاتن) ، بگۆڕێ به (ت) .
وەك :ـ ئەز تێمه دیتن . (ئەز تێم دیتن .)

2 ـ «ڕا» دوو ڕۆڵ دەبینێ لە زمانی کوردیدا :
أ ـ وەکو پێشگر (پرێفکس) .
ئـەمە لە هـەردوو دایالێکتی کـرمانجی (ژوروو و خواروو) دا وەك یەك هەیە . بۆ نمونە :ـ
ڕامالین ، ڕاکردن ، ڕاگرتن ، ڕاخستن ، ڕاکرن ، ڕادان ، ڕازان ، ڕابوون ، ...... هتد .

ب ـ وەکو تەواوکەری (پاشبەند) ئامرازی پەیوەندی .
ئەوەی ڕاستی بێ ئەم «ڕا» یە زۆر بە ئاشکرا لە کرمانجی (ژوروو و خـواروو) دا هەیـە ، تەنیـا نـاوچەی (سلێمـانی) نەبێ کـە زۆر جـار (ەوە) جێگای دەگرێ .
ئەم «ڕا» یە بەم جۆرە بەکار دێت :ـ

## کرمانجی ژوروو

دەبێتە تەواوکەری (پاشبەند) ئەم ئامرازە پەیوەندیانە :
أ» ژ .... ڕا
وەك :ـژناف زارێ چاخێ خوە ڕا بەر ب چەعفبو .
ژمن ڕا گونەیە تەڕا خەبەر دم .
بە پێی فۆنەتیك لە هەندێ ناوچەدا «ژ» دەبێتە «ش» .
ب» ب .... ڕا
وەك : ـ توتی ب مەریا ڕا خەبەر ددن .
ڤێ دنیا پوچە ڤالادا نکـاربونـە ب هەڤـڕابنو هەڤراژی نەبونە .
بەلام ئەگەر فۆنیمی (ێ) . بە دوای ئامرازەکەدا هـات دەبێ بە (پ) . وەك :ـ پێسرا شابو .
ج» ل .... ڕا
وەك :ـ وی چاخی تەیر ل سەر گوند ڕا دفرێ .
د» ڤ ... ڕا
ڤ بولبولرا شەڤو ڕۆژێ
ە» د .. ڕا

وەك :ـ دزو مالخوێ بین ئێك گا د بخێلیێرا دەرێخستن .
بەلام هەرکە فۆنیمی (ێ) بە دوای ئامـرازەکەدا هـات دەبێ بە (ت) . وەك :ـ ئاپۆ وەرە ئەم پرێ چێکن و تێرا دەرباز ببن . لە هەندێ ناوچەدا «کوردی سوریاو بەشێك لە کوردی روسیا وتورکیا وە هەروەها لە شێوەی لوڕیو گورانیشدا» دەبێ بە (ڕە) . وەك :ـ د ڤر ڕە وەرە .

هەر سێ مروڤ ب هەڤ ڕە وەرن .
ژڤێ داباشێ ڕە نفشتەك گەرەکە .

بەلام لە هەنـدێ ناوچـەی تردا ئـامرازی پـەیوەنـدی لادەبرێ وە هەر «ڕا» بە تەنیا دەمێنێ .
وەك :ـ ● «چرا ؟» کە لە «ژ چرا ؟» هاتووە .

● (دایێ ئەوانا تەڕا ڕاست نەگوتنە .) کەلە (دایێ ئەوانا ب تەڕا ڕاست نە گوتنە .) هاتووە .
ئەمە لە کرمانجی خوارووشدا بەر چاو دەکەوێ . لەبەر ئەوە پێویستە زۆر ئاگاداری ئەمـە بینو تێکـەڵی (ڕا)ی فارسی نەکەین .

## کرمانجی خواروو

وەك تەواوکەرێك (پاشبەند) بۆ ئەم ئامرازە پەیوەندیانە دێت
أ» لە ..... ڕا
وەك :ـ ئەو کەسەی دەستی لە ئەوکێ بەرد ڕا .
ب» و ..... ڕا
وەك :ـ وێکرا گەلانی جیهانی دەیلێ بەگیانو زمانی .
ج» ت .... ڕا
وەك :ـ تێکرا دەتەقن .
بەڕای من ئەم «ت» ە لە «د»ی کرمانجی ژورووە هاتووە کە فۆنیمی (ێ) ی دوای دەنگی گۆڕیوە .
د» بە .... ڕا
وەك :ـ پەیامی من بە گوێی ئەم دلبەرە نازدارە ڕا ناگا .
بەلام کە ڤـاولی بە هێـز (بە تـایبەتی «ێ» . بـە دوای

ئـامرازەکـەدا هات ، دەنگی لە گـەڵ دەنگی ڤاوڵی (ە) تێکەڵ دەبێو دەنگی بە هێزەکەیان بەسەر دەکەوێت ، وە لە بـەر ئەوەی ئـەم ڤاوڵە بـەهێـزە : فـونیمی (ب) دەگۆڕێ بۆ (پ) .

وەك :ـ پێسـڕا گەیشتن .

لە هەر دوو دیالێکتـەکانـدا هەنـدێ دەربڕین هـەن ، وەك :ـ

ڤێکڕا ، تێکڕا ، وێکڕا .... هتد .

:ـ پێڕا ، تێڕا ، ژێڕا ، ڤێڕا ... هتد .

زمـان ناسـانی کورد دەربـارەی ئەم دەربـڕینانـەڕای جیاوازیان هەیە [وەکو : پێشگری سادە ، لێکدراو ، بەشێك لە جـوگی داڕێژراو ، کۆمەڵەی یەکەم بە ڕاناوی نـادیار (ضمـیر مبهم) ، ..... هتد] .

بـەڕای من کۆمـەڵەی یەکـەم هەمیشەلە ڕووی واتاوە ئەدڤێربلی چۆنیەتین وە لە ڕووی پێکهـاتنەوە بـەم جۆرە پێـك دێن :ـ ڤێکڕا / ڤ ـ ێك ـ ڕا

تێکڕا / ت ـ ێك ـ ڕا ..... هتد .

کـە (ڤ .... ڕا ، ت .... ڕا ، .... هتـد) ئـامـرازی پەیوەندین ، وە (ێك) لە (ئێـك) یا (یێـك)ە وە هاتـووە [دوای فرێدانی فۆنیمی یەکەمیان] کە واتای ژمارە (یەك) دەبەخشن .

بـەلام کۆمـەڵەی دووەم لەڕووی واتـاوە ئـەدڤێـربـلی نادیارن ، چونکە لەڕووی پێکهاتنەوە بـەم جۆرە پێـك دێن :ـ پێڕا / پ ـ ێ ـ ڕا تێڕا / ت ـ ێ ـ ڕا ژێڕا / ژ ـ ێ ـ ڕا ..... هتد .

کـە (پ ... ڕا ، ت ..... ڕا ، ژ .... ڕا ، ..... هتـد ، ئامرازی پەیوەندین ، وە (ێ) جێگری نادیاری ئەدڤێربلە ، جا ج ئەدڤێربلی شوێن بێ یا چۆنیەتی یا .... تد . بۆ نمونە :ـ

جێگری ئەدڤێربلی شوێن :ـ

د ئافێرا دەرباز بو .

تـــێرا دەرباز بو .

جێگری ئەدڤێربلی چۆنیەتی :ـ

من نان ب وی ڕا خار .

من نان پێرا خار .

وە بەم جۆرە دەتـوانین ئـەوانی تریش دەست نیشـان بکەین .

تەنیا (ڕا)ی پێشگر نەبێ کە لە فارسیشدا هەمان شت هـەیە [هـەرچەنـدە (ر)ی فارسی کـراوەیـە و (ڕ)ی کـوردی تەڵەوە] ، ئەگینا ئەم (ڕا)یانەی کە باسمان کردن فارسی نین ، چونکە (را) لە فـارسیدا بە شێـوەییکی تر بـەکار دێت ، کـە پێویست ناکا لێرەدا لەسەرڕ یبدوێین ، چونکـە سەرچـاوە لە سەری زۆرن .


سەرچاوەکان :

1 ـ محمود زامدار حەمزاتۆف و داغستان نووسەری کورد ژمارە «ە» بەغدا / تشرینی (2)ی 1980 .
2 ـ رؤوف احمد ئالانی کێشەیەك لە ڕێزمانی کوردی بەغدا 1981 .
3 ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف ڕێزمانی کوردی بەغدا 1979 .
4 ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق (دەستەی کورد) بەرگی نۆهەم بەغدا 1982 .
5 ـ جەمال نەبەز / زمانی یەککرتووی کوردی بامبێرگ 1976 .
6 ـ سیابەندۆف سەمەند سیابەندو خەجێ بەغدا 1980 .
7 ـ جەگەر خوین آواو دەستورا زمانێ کوردی بەغدا 1961 .
8 ـ مەلا مەحمودێ دێرشەوی مشتاخاچیا ژ گوتنێن پێشیا بەغدا 1980 .
9 ـ جەگەر خوین فەرهەنگا کوردی هەژمار (1) بەغدا 1962 .
10 ـ هێمن نالەی جودایی چاپی دووەم .
11 ـ ئەحمەدی خانی مەم و زین چاپی سێیەمین هەولێر 1968 .
12 ـ هەژار بۆ کوردستان چاپی سێهەم .
13 ـ نووسینەکانی د. وریا عمر امین لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکاندا .
موحازەرکانی د . فاروق عمر و د . ابراهیم عزیز .
15 ـ هێمن تاریك و روون 1974 .
16 ـ محمدی مەلا کریم کۆمەڵێك لاوك و حەیران بەغدا 1968 .
17 ـ کۆڕی زانیاری کورد ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەغدا 1976 .
18 ـ صادق بهاء الدین ئامێدی دیوانا مەلایێ جزیری چاپایەکێ بەغدا 1977 .
19 ـ د. السباعي محمد السباعي في اللغة الفارسية وآدابها الطبعة الثالثة / قاهرة .
20 ـ د. عبد النعيم محمد حسنين / قواعد اللغة الفارسية / مكتبة الانجلو المصرية / 1975 .
21 ـ د. نور الدين آل علي / دروس في اللغة والادب الفارسي / الشركة التونسية للتوزيع / 1972 .
22 ـ د. محمد وصفي ابو مغلي / البسيط في قواعد اللغة الفارسية / البصرة / 1980 .
23 ـ د. محمد تقي الزهتابي و د. حسين علي محفوظ / قواعد الفارسية / النجف الاشرف / 1973 .

لێکۆڵینەوە

● ئومێد ئاشنا ●

# پەخشانەکانی گۆران

پەخشانەکانی گۆران ڕەنگدانەوەی سەردەمێکی تایبەتی ژیانی گۆران خۆیەتی . ئەم پەخشانە هونەریانە ئەوەندەی شیعرەکانی لە برەودا نەبوون و دەنگیان نەداوەتەوە و وەك ئەوان سەرنجی خوێنەرو ڕەخنەگری بەلای خۆیدا ڕانەکێشاوە . گۆران خۆیشی بەردەوام نەبووە لە سەری و لە ڕاستیدا ئەو گرنگیەی بە شیعرەکانی داوەو هەوڵی تازەکردنەوەی تێدا داوە بەو شێوەیە لە پەخشانەکاندا کاری نەکردوە ، دوا مەبەستو یەکەم مەبەستی نەبووە . ئەم پەخشانانە لای ئێمە زیاتر لەڕوە جوانناسی و ڕۆمانتیکیەکەیەوە وەرگیراوەو گرنگی دراوەتێ . لە نێو ڕستەکانیاندا مەبەستەکانی بوون و نەبوون ، ناسکی خەیاڵی ڕۆمانسی و ترپەی دڵی مرۆڤ تێکەڵ بە نائومێدی و گۆشەگیری و ڕەشبینی دەبینێت . لە پەنا ئەمانەشدا مانای گەش و لەبار بۆ لێکدانەوەو چۆنیەتی ژیان دەدۆزێتەوە .

پەخشانەکانی گۆران زیاتر بە لای مەسەلەکانی ئافرەتو کاریگەری جوانیەکاندا دەچێت ، زیاتر سۆزو هەڵچوون و فرمێسکە . باس لەبە جێ هێشتن و دووركەوتنەوە دەکات ، چیرۆکێکە جوانی و ڕوناکی ڕۆژانی ڕابوردوو وە تاریکی و بێ هیوایی ئێستای ژیانی دەگێڕێتەوە . ئەم هەستانە تێکەڵ دەبن و لە سەردەمێکی تایبەتی ژیانی ئەودا بەتایبەتی لە تاڤ لاوێتیەکەیدا دەتەقنەوەو هێڵێك لە بیرو لێکدانەوەی ئەو دروست دەکەن . بڕوانە ناونیشانی پەخشانەکان :

« چاو ، فرمێسك ، لاوانەوە ، تاسەی لێوی ئاڵ ، ئەنجامی هەڵبەست ، تاسەی هاودەرد » مەبەستو نیازی گەڵێ خەیاڵ و بیرو لێکدانەوەی گۆرانە : دەتوانین دەست نیشانی ئەو ماوە مێژوییە بکەین بە ماوەی ساڵانی کۆتایی بیستەکان و هەتا کۆتایی سییەکان ، واتە سەردەمی گورو تینی شاعیریەتی و دنیای هونەر بۆ هونەری شاعیر .

هەر لە بەر ئەمەشە کە زۆر لایەنی لێك چوون هەیە لە بەراورد کردنی ماناو تەعبیر لێکردن لە پەخشانەکان و گەڵێ لە شیعرەکانیشدا . ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی نووسین و شیعری گۆران یاخود مەبەستو خواستی ئەو یەکان گیرو هاوبەش یاخود یەك مەبەست دەگرنەوە لەگەڵێ لەشیعرو پەخشانەکانیدا . ئێمە لێرەدا بە شێوەیەکی تایبەتی نامانەوێ ئەدەبێکی بەراوردکاری دروست بکەین لە نێوان شیعرو پەخشانەکانی شاعیردا یاخود لە نێوان شیعرو پەخشانەکانی ئەم و شاعیرێکی هەندەراندا . بەلام مەبەستی ئێمە ئەوەیە کە بزانین گۆران لەو پەخشانانەدا دەیەوێ چی بڵێ ؟ ! . چۆن مانای خۆشەویستی و مرۆڤ و تەنهایی و فرمێسك و بیرو تێکۆشان و ساتە ناسکەکانی مرۆڤ لێك دەداتەوەو ئەمانە چۆن بوەو بە چ شێوەیەك بۆی چوە ؟؟ .

هەر لەو پەخشانانەشدا باسی گەورەیی شیعرو دنیا فراوانەکەی شیعری کردوە ، لە پەخشانی ئەنجامی هەڵبەستو نامەی گۆران بۆ پیرەمێرددا تەواو چوتە ناو ناخی هەستو نەستو ئەو ساتانەی شیعری جوانی تێدا لە دایك دەبێ . « کاتێك من و تۆ ئەمرین هەی داخ ، نەعیشوەو جوانی تۆ نە شاعیریەتو عەشقی من ، لە ڕووی زەویدا شوێنیان ئەمێنێ ، ئەو مەلەو ئەم بولبولە دەنووك دەکاتەوە بە ناو ئەوەی پاشە ڕۆژدا بە ناو خواروو ژووری کوردستاندا سەرگوزشتەی عەشقی من و تۆ دەماو دەم ئەگێڕێ ! . وەك بە سەرهاتی شیرین و فەرهاد ، وەك بەسەرهاتی لەیلاو مەجنون » . یاخود

هەر لەو پارچەیەدا زیاتر شیعر لە خۆشەویستیدا دەتوێنێتەوەو شیعر لە گیانی خۆی بە نرخ تر دەزانێ ، خەرامان دەبێت بە نیشانەی تکاو پەنای هانا بردنی دەباتە بەرو خۆکوشتن لەوە بە -شتر دەزانێت کە شیعرێکی خۆی بە دەستی خۆی بسوتێنێ : « ئێستا خەرامـان بەدڵێکی ڕەقـەوە بە ڕقێکی پـڕ لەقینەوە ئەنووسێ ، تکات لێ ئەکەم ئیتر نامەوێ بـژیت ، بە گـەیشتنی کاغەز دەمانچەیەك بنێ بە سەر دڵی خۆتەوە » . هەر بە چەشنی ئەم تێ گەیشتنە لە گەورەیی‌و پایەبڵندی شیعر کە بە پەخشان -ەری بـڕیوە لە شیعـرەکانیـدا هەمـان جێگای داوەتێ . لەم پەخشانەداو لە تاسەی لێوی ئاڵ‌و خولێك بە ناو شاردا بوونی ئافرەت‌و جوانیەکانی خۆیان نیشان دەدەن . ئنجا ئیتر ئـاخۆ هەموویان یەك ئافرەت بوون یاخود زیاتر لە ئافرەتێ ؟ . بەڵام -!خمان ناچێ کە گۆران لەژیانی خۆیدا یاداشتی ژیانی خۆی بۆ بەجێ نەهێشتین بە چەشنێك کـە ئێمە سـوودی لێوەرگرین‌و بزانین ئەو ئافرەتانە کێ بوون‌و ئەم چۆن ڕێکـەوتی کردوون‌و ناسیونی ، لە پاشدا چۆن لە ژیانیدا نەماون‌و لەبیر چونەتەوە . من دڵنیام کە خەرامان دەست کردی خەیاڵێکی ڕۆمانتیکی نی‌یە . کەسێ نی‌یە شاعیر لە خەوێکدا دیبێتی‌و هیچی‌تر ، خەرامان ناوێکی خواستراو بوە بۆ ئافرەتێك کە توانیویەتی لە هەست‌و ویژدانی گۆران‌دا وەك کانیاوێکی سەرەتای بەهار بتەقێتەوە . ووشـەکـانی ببێ بـە ڕیـزێکی مـرواری‌و بـدرەوشێتـەوە درەوشانەوەیەکی نەدەبی .

گۆران لە پەخشـانەکـەیداو لە دیـوانە شیعـرەکەیـدا خـەرامان دەکـاتە خـورپەی دڵ‌و دەڵێ « ئـەو دیوانـەی کـە سەرانسەر ئەلف‌و بێ‌ی فرمێسك‌و هەناسەیە ، تاقە حەرفێکی شادمانی تیایە ئەویش زەردەخەنـەی خەرامـانە ، خـەرامان یەکەم ڕۆژی جەژن بوو کە بەر جلوەی زەردەخەنەی کەوتم ، نیتر لەپاش ئەوەی لەمەعبێنی مەستی‌و کەللەیی بوونا شۆڕێکم بە سەردا هات ئەزانی چیم کرد ؟ . خۆیشم نازانم هەر ئەوەندە نەبێ لە گردی سەیوان لە گوممەزەکەی شێخ مارف کە هاتمە دەرێ خەڵق ئەیان وت : ئیمڕۆ ئاخر ڕۆژی جەژنە . کـەوابێ دووشـەوو ڕۆژی تـەواو پیـاوێکی شێتی شیعـرو دڵداری لە قـەڵەبـاڵغی جـەژنی سلێمـانی تـەریـك بـووە . خـزاوەتـە قەبرسانێکەوە ، لە باتی نان بە خەوبینین لەباتی ئاو بە خەیاڵ لە باتی ئاگر بە جۆشی دڵ لە باتی ڕووناکی بە نەشئەی زەردەخەنە قنیاتی کردوە . لە گەڵ ئەوەشدا لە هەموو دەمارێکم خـوێنی شادمانی لافاوی هێزو زیندەگانی فیچقەی دەبەست چـونکی هەموو جۆشی دڵم ، هەموو نەشئەی کەللەم ، هەموو ڕووناکی ژیانم ، هەمـوو تین‌و گـەرمایی دڵداریم بـە دوو ڕۆژ لە قاڵبی هەڵبەستێکی درێژا داڕشتبوو » . بەڵێ .. گۆران ڕۆیشت ڕەنگە خەرامانیش هیـچ ئەسـەرێکی لەم دنیایـەدا نەمـابێ . بەڵام کۆمەڵێ دەنگ بەیـەکدا دەچن‌و دەڕۆن‌و دێنـەوە . شەپـۆلێك بەردی کەنار دەریایەك دەشواتەوەو سنگ دەبـاتە پێشـەوەو دەگەڕێتەوە ، نە دەنگەکان کپ دەبن‌و نەدەریاکە ساتێك ئارام دەبێتەوە .

ئێمە تەواو پێویستمان بە گێڕانەوەو ڕوون کردنەوەی بە سەرهاتی ژیانی گۆرانە زۆربەی لایەنە زاتی‌و دڵداری‌و جوان ناسیەکانی ژیانی هێشتا نهێنین تـەنها؛ چـەند لاپـەڕەیەك لە یاداشتێك کە خۆی بی‌نووسیایەوەو ڕووناکی بخستـایە سـەر لایەنە تاریکەکان ، بۆئێمە کردنەوەی پەنجەرەیەکی داخراو بوو کە دەمانتوانی لەو پەنجەرەیەوە بە سەر لایەنە شـاراوەکانی ژیانیدا بڕوانین . بەڵام داخەکەم ئەو لایەنانە هەرگیز ڕووناکی نابینن‌و تاریکیان لەسەر لاناچێ‌و ئەو نهێنیانەش لە سووچێکی گەردوون‌و ویژدانی مرۆڤایەتیدا کپ‌و هەرگیز کپ دەمێنێتەوە .

وەك وتمان ئەو دنیایەی ئەو سەردەمەی کە گۆران ئەم پـەخشـانـانـەی تێـدا نـووسی لەژێـر دوو بـاردا ئـەمی دەچـەوسانـدەوەو خەمبـار بوو . لە لایـەکەوە لە ژێـر باری چەوساندنەوەو ئاڵۆزی کۆمەڵداو نەبـوونی‌و هەژاری خـۆی‌و لەلایەکی تریشەوە باری دەروونی وەك شـاعیرێـك‌و هەستی دڵداری‌و جوان پەرستی ، ئەم دوو لایەنەو بە تایبەتی لایەنی دووەم لەسـەر جەمی پـەخشانـەکانـدا زاڵەو زیاتـر لەباری ڕاستـەقینەی گـۆران دەدوێ‌و نموونـەو نیشـانی کت‌و متی هەست‌و لێك دانەوەی ئەوە . بەگشتی تەمەنی لاوی شەقامێکە مرۆڤ تەنهـا جارێـك لە ژیانیـدا پیایـدا گوزەردەکـات ، ئیتر جارێکی‌تر پیایدا ناڕواتەوەو تەنها بەڕێکەوت ڕێ‌ی دەکەوێتەوە کۆمەڵێ بیرەوەری‌و یادی ڕۆژانێك کە بەو شەقامەدا ڕۆیشتبوو .

ولیەم ورد زورث شیعرێکی زۆر بەرزی بۆ یادی بیرەوەری ڕۆژانی منداڵی خۆی نووسیوە . گۆرانیش دەنووسێت : « هەروا

لە بیرمە نیوە شەوێکی ئەستێراوی هاوینی (1929) لە بەردەمی پێنجوینی خەوالوودا زەبری زەمانە دەستی برایەتی دوو بێتاوانی لە ملی یەکتری بچڕی . تارمایی بە دەم هەنسکەوە لە ناو ڕەشایی گولەکانا بەرە بەرە ون بوو . منیش بەسەر بارگەیەکەوە بەرەو تەوێڵە شوێن کاروانی هەڵەبجەو ناڵە ناڵی زەنگی تاریکی کەوتم » . لەهەمان پەخشاندا واتە لە لاوانەوە بۆ برایەکی جوانەمەرگدا دەڵێت : « ساڵی 1928 چەند خۆشحاڵ بووم کە هەردووکمان پێکەوە بووین بەژێر بەفرە زۆرەکەی پێنجوینەوە . ئەو زستانە درێژەمان بەدیار ئاگرێکی خۆشەوە بە پێکەنینو گۆرانی بردەسەر ، تۆ بە تەواوی بۆ نەوجوانی ژیان خولقابووی . بەیانی هەتا ئێوارە وەك هەنگی برسی بەگۆرانیوتنو بە شوێن گوڵی ڕەنگاو ڕەنگو شیلەی شیرینا ئەسووڕایتەوە . ڕۆشنایی ژیان ئەوەندە تیژ بوو سەرچاوەی شادی هەنگوینی هەرزەکاری لە تاریکترین پێچو پەنادا بوایە بەشارەزایی ڕێت ئەبردە سەری . منیش هەمیشە بەشوێنتەوە بووم » .

گۆران توانیویەتی لە ڕووی تەکنیكو شێوەی داڕشتنەوە پەخشانەکانی هەروەك شیعرەکانی لەبەرهەمی کەسانی جگە لە خۆی جوێ بکاتەوەو رووکارو ناوەرۆکێکی تایبەتی بداتێ . لە وورد بوونەوەیەکی تەواو لەو پەخشانانە دەردەکەوێ کە گۆران لەو کاتەدا بێ ئاگا نەبوە لەو بزوتنەوە ئەدەبیو تازە گەریەی کە چەند شاعیرێکی تورك کردبویان ئەمە هەر لەو سەردەمەشدا لە شیعرەکانیدا دیارو ئاشکرایە ، باری هونەری پەخشانەکانو ئەو مەسەلانەی کە تیایدا باسکراوە زیاتر هەڵدەگرێ بۆلەسەر نووسینو شی کردنەوەی لایەنە جۆر بەجۆرەکانی . بۆ نموونە خۆی خەریك کردوە بە لێكدانەوەی مانای فرمێسکەوەو لە چۆنیەتی فرمێسك دواوە . ئەگەر بێتو بگەڕێینەوە بۆ دنیای ئەو دیوی ئەو پەردەیە ، شتی گەورەتر دەبینین کە گۆران توانیویە سەبارەت بەفرمێسك ئەنجامی بداتو گوزارەی ڕاستی لێ بکات لێرەشدا سەرەڕای ئەو قاڵبە ڕۆمانتیکیەی کە نووسەر پەخشانەکەی تێدا داڕشتوە ، باری زیاترو زۆرتری بەخشیوە بە مرۆڤو ئەوی لە سەرو شتەکانی ترەوە داناوە . لە دلۆپی فرمێسکدا تەواوی ئێشو ئازارەکانی مرۆڤی بەدی کردوە . دیارە ئەوەندەی ئەو خەیاڵەی پێی مەست بووەو قوڕتەکانی ژیان فرمسکی خستوتە چاوەکانییەوە پڕ بەپڕ نەیتوانیوە هەرچی نهێنیەکانی فرمێسكو بەزەییو دڵ شکاویە بخاتە چوارچێوەی پەخشانی فرمێسکەوە . بەلام سەرەڕای ئەمەش هێندە عاشقانەو شاعیرانە دلۆپێ فرمێسکی خستۆتە ژێر شی کردنەوەو لێوردبوونەوەی هەستو هەڵچوونی دەرونی هەتا تەواو گەرمی دڵیو گەرمی فرمێسکە کە دەبنە یەكو وەلامی ئەم پرسیارانە دەداتەوە ، فرمێسك لەبەر چیو بۆ چی ؟ ! . ئایا فرمێسك ئەنجامی کوڵدانو بەزینە یاخود ئەنجامی دڵ شکاویو لێك بڕانو جیا بوونەوەیە ، یاخود تەقینەوەی کانیاوی خۆش بەختیو کامەرانییە ؟ . گۆران وەلام دەداتەوە « فرمێسك گەوهەرێکی خۆشەویستییە کە خالق لە ناو هەموو مەخلوقاتا تەنیا پێشکەشی ئینسانی کردوە . لەبەر ئەوە فرمێسك ئەوەیە کە تەنیا بە سەر دەردێکی ئینساندا تلۆر ئەبێتەوە یاخود ئەتکێتە برینێکی نەزیهی دڵەوە » . لێرەدا دەپرسین ئایا مرۆڤ پێویستی بە فرمێسك هەیە یاخود نەء . خۆ ئەگەر فرمێسك نەبوایە بە چ هۆیەك قوڵپی ئێشو ژانی ناخی کەمێك تەسەلاییو سەبووری تێدەکەوت ؟ . گۆران وتەنی ئەو فرمێسکە نەبوایە چ دلۆپە ئاوێکی گەرم وەها ئەرژایە برینێکی نەزیهی دڵەوە ، مەبەستی پەخشانەکان لە یەکترەوە نزیکن . کە فرمێسکی باسکرد ڕێڕەوی هەمیشەیی فرمێسکیش باس دەکات هەروەك شێخ نوری شێخ صالح وتەنی کە دڵ ئەبێتە قەترەیە خوێنو لە دیدەم سەر ئەکا چاو ئەم قەترە خوێنە پێشوازی دەکات . لای گۆران جوانی چاو بریتییە لە « دوو پەڕە لە کتێبێکی موقەدەس پڕە لە ئایەتی حوسن ، حەقیقەتەکانی ڕۆح ، سڕەکانی دڵ ، ڕازەکانی دەرون بە حەرفی نوور تیا نووسراوە ، ئاخۆ لە چاو بەلیغ تر ، لە چاو پڕ مەعناتر ، لە چاو سیحراوی ترچ ئەسەرێکی ڕۆحی ، چ کتێبێکی ئاسمانی هەیە » . دیارە هەردەبێ جووتێ چاوی وەها بووبێ کە جوانیەکانی هێندە کاری گەر بووبێ وەها بە تاو هەڵی کوتابێتە سەر عاتیفەی ناسکی لاوێك کە ناوی عبدالله سلێمان بوەو بە جۆرێك ئێخەی گرتووە کە نە توانێ لە ژێر ئەو کاری گەریەدا چاو دانەنێ بە تەنیا کتێبێکی ئاسمانیو لەو سیحراوییو جوانتر هەرنەبێت . ئنجا لە چاوی شینو لە چاوی ڕەش و هەنگوینیو پیرۆزەییدا جوانیەکان کۆدەبنەوەو بە هەموویان شوعلەیەك دروست دەکەن . کە ئەم شوعلەیە لە ڕۆحی نزیك دەبێتەوە کپ لە ناخەوە هاواردەکات : « ئەی چاوە جوانەکان ، شوعلەیەك لە ئێوەدا

هەیە پێی دەڵێن شوعلەی پرشنگی عەشق و سۆز . هەرچ دڵێك ئەو پرشنگەی تێ نەرژا بێت هەرچی شوعلەی ئەرزو ئاسمان هەیە بە جارێك هەڵگیرسێت ئینجا قوژبنێكی لێ روناك ناكاتەوە »

ئەم جوانیانە لای گۆران شتێكی هەروا لە خۆوەو دەستكرد نەبوە ، بەڵكو دەتوانین بڵێین بەستراوەتەوە بە دوو لایەنەوە، یەكەم وەك بەهرەو بوونێكی خۆرسكی ، دووەم وەك ئەو بارە كۆمەلایەتیەی لە دەوروبەریدا بوەو ئەوخۆ پەروەردە كـردن و خوێندنەوە بەردەوامەی كە هەیبوە . لەگەڵ ئەوەشدا كە گۆران ـموەیەكی مێژوویی تایبەتی لەم قۆناغەدا مایەوەو باری ژیانی خۆی و جۆری بیركردنەوەی وەها بوو كە پاش چەنـد ساڵێـك بەرەو ئەدەبی مولتەزیم و ئەدەبێك بڕوات كە كەمتر خۆی بەو مەسەلانەوە ببەستێتەوەو زیاتر بەلای مەسەلە بەر بڵاوەكان و تێكۆشانی كـۆمەلایـەتی و رامیاری بچێ . بـەلام ئەمـە ئەوە ناگەیـەنێ كە ئیتر هـەرگیـز بـەلای سـروشت و جـوانیـدا نەچوبێتـەوەو گۆرانی بـۆ نەوتبێتـەوە ، بـەڵكـو لە گـەلێ لە شیعرەكانی دوایی ژیانیدا كـەم و زۆر بۆ ئـەم جۆرە ئـەدەبە چوتەوە ، وەك لە شیعرەكانی ـ بێداریەك ـ و ـ بەرەو كۆنفرانس ـ و ـ مۆسكۆی جوان ـ و هەندێكی تریشدا باسی كردووە .

پـەخشـانـەكـانی ( ئـەسـەفی مـاضی و ئـەنـدێشـەی نیستیقبالم ) لە چلەی پیرەمێردو خولێك بە ناو شارداو نامەكەی گۆران بۆ پیـرە مێرددا دەبینـین باسـەكان جیـاوازتر خـۆیان دەنوێنن و هەست دەكـەین نووسـەر خـۆی دەبـەستێتـەوە بـەكۆمـەلێ لەو نیشانـانەی كـە نموونـەی دڵسۆزی بێت بـۆ نیشتمان و میللەتەكەی . لە پێش ئەمەشداو لە سەرەتای ژیانی نووسینیدا هەر بەم دڵسـۆزیە لە هـەلوێستی خۆی دواوەو ئەگەرچی لەهەندێ لایەنیدا واتە لەپەخشانی ـ ئەسەفی ماضی ـ ـدا جۆرە رەش بینی و دەست لەژیان شتـێكی تێدایە ، بـەلام بەگشتی ناوەرۆكێكی نیشتمان پەروەری هەیەو نووسەر هەر لەو دەرگایەوە هاتۆتە ناو نووسینەكەیەوە . « خۆلاسە مێشكی من وەك فتوگرافی ژەنگ گرتـووی جەرِ تێـك چوو وایـە عەكسی غایەی سورەت زێبای مطالەعەت بە تەواوی جەزب ناكا . لازمە وەستای بە دیقەت كە معلمی صاحب سەعادەت بێ بەجۆرێ دروست بووە بە مەنفەعەت ئەم ژەنگە لابەرێ و لە فابریقـەی مەكتەبا بە ئەسبابی نصایحی خەیر ئەو جەرە چاك بكاتەوە » . لێرەدا دەوەستێ و ئاوڕ بـە لایەكی تـردا دەداتـەوەو دەڵێ :

« بەلام چونكە ئەم ولاتە بە سەزمانەو ئەم دایكە موشفیقەمان چاوەروانە بۆ تێكۆشان و محتاجی یاریە دانە » . وەستان لەسەر ئەم خاڵەو لێ وردبونەوەی دەمانگەیەنێتە ئەنجامێك كە تەواو لە نـاوەرۆكی گشتی خەیـاڵ و لێكدانـەوەی نووسـەر بگـەین لە تەمەنێكدا كە لە هەژدە ساڵ تێ نەپەڕیبوو وە لە هەڵەبجە بووە . لە كۆتایی پەخشانەكەیدا ناوی خۆی وەها نووسیوە « شاگرد مكتب ـ هەڵەبجە لە هۆزی كاتب فارسی عبدالله صبری » . لەو پەخشانەدا تاریكی ژیانی كەسێتی گۆران دەبینین كـە ئەو لە تـەمەنێكی وەهـادا هەستی بـەبێ هـودەیی و بێزاری ژیـان كردووەو خۆی وەها داناوە كە بوون و نەبوونی ئەم لە بەرانبەر ژیاندا وەك یەكەو ئەوەندەی گەورەیی دەریاكان خەم و ناسۆری ژیان لە دڵ و دەرونیا كۆبۆتەوە . بەلام لەپاش ئەمە دێتە سەر ئەوەی لەم بیرو خەیاڵە دوور كەوتبێتەوە كە نیشتمان لە قۆناغی هەنگاونان و هوشیاریدایەو پێویستیشی بەم هەیە كە لای خۆیەوە شتێك پێشكەش بكات لە خزمەت و لە خۆ بووردن .

لە ئەنجامی ئەم بەراوردو بە شوێن گەڕانەدا دەگـەینە ئەو ئەنجـامەی كـە پەخشـانەكـانی گۆران لەو سـەردەمەدا هەنگاوێكی ئەدەبی گەورەو پتەو بوو لە ڕووی جۆری داڕشتن و تەكنیكەوە ، لە ڕووی بەكارهێنانی ووشەو داهێنانی هەلوێستەو خاڵ و دەست پێكردن و كۆتایی پێ هێنانەوە ، لە ڕووی سۆزو تێكەڵ كردنی ئەو سۆزەو ئەو بابەتەی كە دەربارەی دەی نووسی هـەولێدەدا پەخشـانەكـان زمانێكی شیعـری وەربگـرن . لە درێژەپێ دان و جوینەوەو لاسایی كردنەوە خـۆی دەپاراست و واتاو گوزارەی كـوردی ڕەسەنی بـەكار دەهێنـا . تەواو لەو پەخشانانەدا ڕاستگۆ بوو . ئەگەر جوانی ئەو چـاوەو گەرمی فرمێسك تەواو كاریان تێ نەكـردبێ نەیتـوانیوە دەربـارەیان بنـووسێ . دیارە لای گـۆران هەمیشـە ئەو هـەست و سـاتـە ناسكانەی شیعرو پەخشانی جوانی تێدا لە دایك دەبن زیاتـر بوون و گەورە تر بوون لە ئاست دەربڕینیانداو لەگەڵ ئەمەشدا ئەو هێندەی لێ دەربڕیوە كە نموونەی بەرزی شیعرو پەخشانی سەردەم و هاوچەرخ بێت . چەند شیعرەكان توانیان بەرگەی ڕۆژگار بگرن و نەمرین، پەخشانەكانیش هەروەها لەگەڵ كەمی ژمارەشیاندا گەلێ ڕێنمایی و دەست پێشكەری وەهای تێدابوو كە هەتـا ئەمـڕۆ داهاتـویەكی زۆر دووریش، لەگـەڵ ئازارو ئاواتەكانی مرۆڤدا بەردەوام لە ژیاندابن .

# شانۆیا کوردی

## ریباز و داخاز

وصفی حسن ردێنی

شانۆ نافەکە بو هونەرەکێ مەزن و بەرکەفتی ، شانۆ فاژیکرنا ئازارو کوفان و ئاواتێت مروڤی یە ، شانۆ وەرگێرانا ژیانا میللەتایە ل سەر (دەپێ) شانۆیێ .

میللەتێت جیهانێ گەلەك بایەخی د دەنە شانۆیێ چنکو شانۆ ئالاڤەکێ شارستانیەتیێ یەو شانۆ روناکبیریەو خەباتەو پەروەردەیە .

بێ گومان میللەتێ کوردی ژی وەکی هەمی میللەتێت دی پێویستیا ب شانۆیێ هەی و گەلەکاژ کورێت ڤی میللەتی ژیانا خو یا تەرخان کری بو ڤی هونەری وەك [ ع . ع شەونم ـ حەمە کەریم رەمەزان ـ ابراهیم سلمان ـ ئەمین میرزا کریم ـ رەفیق چالاك ـ عثمان چێوار ـ فوئاد مجید میسری ـ سعدون یونس فهمی کاکەیی ـ فاضل جاف ـ عبدالله اسماعیل برواری ـ ئەحمەد سالار ـ کاوە ئەحمەد میرزا ـ سعید زەنگنە ـ بدیعە دارتاشی ـ محمد عبدالرحمن زەنگنە ـ هتد ... ] بەلێ پا هەتا نهو ژی شانۆیا کوردی یا د پلەکا کێم دا و ئەم دشێن بێژین شانۆیا مە هەولدانن ، هندەك ژ هونەرمەندێت مە دبێژن ئەگەرا ڤێ پاشکەفتنێ ئەوە کو هەتا نهو جەماوەر گرنگیا شانۆیێ نزانیت و

روشنبیریا هونەری و شانۆیی یا کێمە دناڤ جەماوەری دا ، بەلێ ئەز دبێژم ئەڤ دیاردە (ظاهرة) هەتا بەری دەهـ سالا ژی هەبو ، لێ نهو جەماوەرێ مە ل کوردستانێ یێ گەهشتیە پلەکا روشنبیری کو هەر تشتێ باشبیت و د خزمەتا میللەتی دا دێ ب سینگەکێ فراوانە وەرگرن چ شانۆ بیت یان تەشکیل بیت یان ئاواز بن ، هندەك هونەرمەندێت دی دبێژن ئەگەرا پاشکەفتنا

شانویی ل کوردستانێ ئەوە چنکو مە نفیسەڤانێت .
شانویێ نین ، ئەوژی دگەل ڤی دەنگێ مەو ئەڤ چەندە ناهێتە ڤەشارتن .

بەلێ بەری لدویڤ ئەگەرێت پاشکەفتنا شانویێ بچین ب دروستی دا ئاڤریەکێ بدەینە شانویێ .
ل سالا 1880 ز ئێکەمین شانوگەری ل عیراقێ هاتە پێشکێشکرن ل بازیرێ مویسل ناڤێ شانویێ « الشماس » بوو ژ دانانا ( حنا حبش ) بو ئەڤە ژ لایەکی ڤەو ژ لایەکێ دیڤە ئێکەمین وکەڤنترین دەقێ شانویێ ل کوردستانێ ( مەمێ ئالان ) بو ئەڤ شانوگەریا دوو پەردەیی ژ نفیسینا ( عبدالرحیم رەحمی هەکاری ) یە هەر وەسا شانوگەریا مەمێ ئالان ل گوڤارا [ ژین ] ژمارە (15) هەیڤا ئاداری ل سالا 1917 ز هاتە بەلاڤکرن ، نفیسەڤانێ ڤی شانوگەریێ ب زارێ کرمانجیا ژووریێ و شێوازەکێ هەڤچەرخ یا نفیسی و بخو سود یا ژ تێکستێ فولکلوری ( مەمێ ئالان ) وەرگرتی و دووەمین شانوگەری .
ل کوردستانێ شانوگەریا « عیلم و جەهل » ئەوا ل سالا 1926 ز بازیرێ سلێمانیێ هاتیە پێشکێشکرن .
بینەرو جەماوەرێ شانویێ ل سالێت سیهێ و چلێ و پێنجیێ و شێستێ تە وەك بینەرو جەماوەرێ ڤێ گافیێ ( مەبەست سالێت حەفتێ و پێڤەل ) بینەرێ هنگی دچو پێش شانویێ ژ بەر بێشولیێ و ژبەر وەخت گوشتنێ لێ بینەرێ ڤێ گافێ پشتی جورەکێ روشنبیریا شانویی ل دەڤ پەیدابوی دچیتە پێش شانویێ ژبو سودوەگرتنێ و زێدەکرنا روشنبیریا خوو ناسینا هونەرو ئازاریێت میللەتاو مروڤی .

پێشکێشکرنا شانویا ل کوردستانێ سال بو سالێ زێدەبو ب تایبەتی ل سلێمانیێ و هەڤلێریێ و ڤێ دویماهیێ ل دهوکێ و جەماوەرێ شانویێ روژ بو روژێ زێدەبوو بێ گومان هندەك شانویا پتر ژ هندەکێت دی جەماوەر هەبوو پتر جهێ خو د دلێ خەلکێ دا هەبو ( ئەڤ چەندە دمینیتە ل سەر هزرو ناڤەروکێت شانوییێ و .
کات و جهێت شانوییێ و هەر وەسا تیپ و دەرهینەرێ شانویی ) بو نمونە : ـ
شانوگەریا ( سەرینی باداری ) یا ئەحمەد دەنگ گەورە ل سالا 1969 ز دەهـ روژا ل دویڤ ئێك هاتە پێشکێشکرن ل هولا بەرەڤیا سلێمانیێ .
شانوگەریا (ئابلوقە) یا غازی بامرنی ل سالا 1976 ز هەژدە روژا ل دویڤ ئێك هاتە پێشکێشکرن ـ شانوگەریا (دوورەك) یا فاضل جاف ل سالا 1979 ز (7) روژا هاتە پێشکێشکرن .
شانوگەریا ( رەجەب و پیاو خوران ) یا ئەحمەد سالار ل سالا 1975 ز (21) روژا هاتە پێشکێشکرن .

شانوگەریا (راپورت) یا فوئاد مجید میسری ل سالا 1980 ز (20) روژا ل دویڤ ئێك هاتە پێشکێشکرن ل سلیمانیێ و شانوگەریا [ سلەی نانکەر ] چل روژا هاتە پێشکێشکرن ل سلیمانیێ سالا 1983 .

لدور بزاڤا شانویێ ل دەڤەرا بەهدینا بێ گومان بزاڤەکا کێمەو لاوازەو خەلکێ ڤێ دەڤەرێ ژ سالێت ( حەفتێ و بەرو ئەڤراز ) شانو ب رەنگەکێ زانستی و (عەمەلی) یا نیاسی ، بەلێ یا هەژی گوتنێ ئەوە ڤێ گافێ تیپا (بزاڤ) ل دهوکێ یا هەی و ئەڤ تیپە پێکهاتیە ژ چەند گەنجێت بسهورو ئازاو جەماوەرو حەزکەرێت هونەری باوەریەکا موکم یا بڤێ تیپێ هەی .
ل ڤێرە من دڤێت ڤێ راستیێ خویا بکەم ئەوژی ئەوە ئەگەر ئەم وەك (هێلەکا بەیانی) بەرێ خو بدەینە رێبازا شانویا کوردی دێ بومە ئاشکرابیت کو پشتی سالێت حەفتێ ب شێوەکێ گشتی ل کوردستانێ روشنبیریا شانوییێ و هونەری یا زێدبیت و جەماوەر پتر ل دویڤ دەنگوباسێت هونەری و شانویێ دچیت چنکو هونەر عەشقەکا پیروزە بەرامبەر خاکی و میللەتی و مروڤایەتیێ و جەماوەرێ کورد وەك هونەرمەندێ هێژا ئەحمد سالار دبێژیت « جەماوەرێ کوردی شانویەکا .

نێزکی گیانێ خو دڤێت و خو تێدا ببینیت و ژبەر ڤێ چەندێ گەلەك جارا شانویا بیانی ژی تامەکا کوردی یا دایێ و دڤێت بزانین کو هەمی میللەت بایەخی ددەنە شانویا بیانیێ و بەلگە بو ڤێ چەندێ گەلەك نووسەر بیت بوینە خەلکێ هەمی وەلاتا وەك شکسپیر ، مولیر ، چیخوف ، گورکی و دڤێت بێژین هەر چەندە مە لەشکەرەکێ تورەڤانا یێ بەلێ نفیسەڤانێت شانویی ب تلێت دەستا تێنە هەژمارتن ، ئەڤجا ئەگەر ئەم ل

دویڤ ئەگەرێت پاشکەفتنا شانویا کوردی بگەڕین وێ ڤان خالا دانینە بەر چاڤ : ـ

1 — نەبونا دەقێت کوردی چ بیێت فولکلوری‌و چ بیێت هەڤچەرخ‌و ئەگەرا ڤێ چەندێ بێ خەمیا تورەڤانێت کوردە چنکو ئەگەر بزڤڕینە فولکلورێ خویێ ئەدەبی‌و یێ رامیاری دێ ب دەها دەقێت شانویی ژێ بەرهەڤکەین چنکو فولکلورێ مە پڕە ژ حیکایەت‌و سەرهاتێت شەڕاو ئەڤینداریێ‌و مێرخاسیێ‌و نیشتمان پەروەریێ ، ئەڤجا کێماسیە ئەم ڤی سامانی پێلین‌و بزڤرینە دەقێت بیانی‌و بکەینە کوردی‌و پێشکێشکەین ، هەر چەندە پێشکێشکرنا هندەك شانوگەرێت بیانی باشەو پێویستە بو هەمی گەلا چنکو دێ مروڤ ئەدەب‌و هونەرو ئازارێت میللەتەکێ دی نیاسیت‌و ب سەر هەلبیت بەلێ نەك ل سەر حیسابا ژبیرکرنا کەلەپورێ مە .

( خەج‌و سیامەند ) چیڕوکەکا ئەڤینداریێ‌و وەفاداریێ یە رویدانێت وێ ل کوردستانا تورکی بیێت بوین برایێ هێژا فوئاد مجید میسری یا بەرهەڤ کری ژ فولکلوری‌و کریە شانوگەری‌و ل سالا 1979 ز تیپا ( پێشرەوی شانویی کوردی ) ل سلێمانیێ پێشکێشکرو هەر وەسا وەك کتێب هەر وێ سالێ کەفتە بازاڕی ، دگەل رێزگرتنا مە بو هێژا فوئاد مجید میسری‌و تیپا پێشرەوی بەلێ وەك تێبینی دێ بێژم ئەگەر تیپەکا دەڤەرا دهوکێ پێشکێشکر با رەنگە ئارمانجبەترو روهنتربا چنکو ئەڤ شانوگەریە پتر بو هونەرمەندو تورەڤانێت دەڤەرا بەهدینا دکەفت ، هەروەسا دگەل سوپاسیەکا گەرم‌و گوڕ بو هەژی دکتور نافع ئاکرەیی ل سەر نڤیسینا شانوگەریا ( شیخێ صەنعانی ) بەلێ ب هزرا من ئەگەر ب زارێ کرمانجیا ژووری نڤیسیبا بەلکو دا پتر دجهێ خودابیت‌و دا هەژی تر بیت‌و دەرباری دەقێت کوردی بیێت هەڤچەرخ ب راستی زور دکێمن هەر چەندە زور دڤەرن .

2 — بێ خەمیا تورەڤانێت کورد ب شێوەکێ گشتی نەمازە ژ لایێ بەرهەڤکرنا دەقێت شانوێی ژ فولکلوری یان وەرگێرانا هندەك دەقێت پێشکەفتنخازو ئارمانجبەر بو زمانێ کوردی دا بزاڤا شانوێی هەر یا بەردەوامبیت‌و سستی نەکەڤیتێ .

3 — نە گرێدانا کوڕو میهرەجانا ل سەر بابەتێ شانوێی ، ئەڤە ژی دێ بو مە کێم‌بونا روشنبیریا شانوێی پەیدا کەت .

ژ بلی ڤان ئەگەرێت سەرەکی هندەك ئەگەرو کێماسیێت دی ژی بیێت هەین . لێ ڤان ئەگەرا ژی چارەسەرکرن یاهەی‌و ئەڤ (خالیت) خارێ هندەك رێکێت چارەسەرکرنێ نە ژبو پێشکەڤتن‌و گەشبونا شانویا کوردی : ـ

1 — دڤێت دەزگەهێت روشنبیری ل کوردستانێ پتر یارمەتیا بدەنە تیپێت شانوێی وپتر هاریکاریێ دگەل هونەرمەندا بکەن .

2 — پویتەکرن‌و هاندانا پشکا شانوگەریێ ل ئاموژگاریا هونەرێت جوان ل سلیمانیێ‌و پەیدا کرنا دەقێت کوردی .

3 — زێدەکرنا روشنبیریا شانوێی ل کوردستانێ ب رێکا بەلاڤکرنا گوتارا ل روژناماو گوڤاراو پێشکێشکرنا پروگرامەکی ل ئێزگا کوردی ل سەر شانوێی‌و هەر وەسا گرێدانا کوڕو میهرەجانا ل سەر ڤی بابەتی‌و ژبیرا مە نەچیت کو ( تیلڤزیونا کەرکوکێ ) دەورەکی سەرەکی یێ هەی ژبو زێدەکرنا روشنبیریا شانوێی ب رێکا پێشکێشکرنا هەمی شانویا ل تیلڤزیونێ دا هەمی رەنگێت بسەرا ببین

4 — ئاڤاکرنا هولەکا هەڤچەرخ بو شانویا کوردی ل دەڤەرێ‌و ب شێوازەکێ بەرفرەهو رێك‌وپێك‌و هەروەسا پویتەکرن ب شانویا زاروکا .

ل دویماهیا ڤێ نڤیسینی مە دڤێت دیارکەین کو ئێکەمین کچ ل کوردستانێ سەرکەفتیە ل سەر دەپێ شانوێی « گولیزار عمر » ە دەمێ پشکداری کری د پێشکێشکرنا شانوگەریا [ مەم‌و زین ] ل سالا 1958 ز ل سلیمانیێ‌و هیڤی دکەم ئەز شیابم دڤێ نڤیسینا کورت‌دا هندەك ژ رێبازو گرفتاری‌و داخازێت شانویا کوردی بو خوێندەڤانا بدەمە زانین .

## ـ ژێدەر ـ


1 — نووسەری کورد ژمارە (8) سالا 1982 ز گوتارا ـ تەماشاکەر لە شانوی کوریدا ـ یاسین قادر بەرزنجی .

2 — روژناما [ عیراق ] ژمارە (2173) روژا 23 — 3 — 1983 گوتارەك ب کوردی ژ نڤیسینا تورەڤانێ هێژا محمود زامدار .

3 — گوڤارا روژی کوردستان ( ژمارا تایبەت ) سالا 1980 ز .

4 — الطريق والحدود ـ يوسف عبدالمسيح ثروت ـ بغداد 1977 ز .

فەکولین : صدیق شرو مزوری

# کورتە چیرۆك

# رویدان و وەغەر

نی هونەرە ل سەدیَ آیا رویدای ، و د توریَ روژ ئاڤادا هاتیە نیاسین ، و کورتە چیروك نە هەما هندە پەریَت نڤیسانیَ نە ێ مەبەست ئەوە کو تایەکیَ نویەوتازەیە ژ تایبیَت تورەی روخسارە تایبەتی هەنە رەنگ و سیماهیَ هونەری هەنەو یی هاتیە بیَناسین ژ لایی گەلەك نڤیسڤاناڤە روژهەلات وئاڤا ژوان پلیمەتا « ئەدگار ئەلان پو » یی گوتی :

« ب راستی کورتە چیروك یا جودایە ژ رومانیَ وسەخمەراتی ڤیَ ـەلیڤیَ ئەم دشیَن بیَژین کورتە چیروکیَ هەرسیَ ئیَکاتیَت خو هەنە ب کارتیَن مینا جیَگای .. کات .. کریار یا کو شانوا فرەنگی نیاس و چیروك کەسەکی دەردگریت یان کریارەکیَ یان سوزو خوتیَك دانەکیَ یان هندە رویدانیَت هیَژا هەر وەسا «پو» نەل ڤیَ چەندیَ راوەستیا لیَ لسەر روخساری ئاخڤت لسەر کورتیی و دریَژیی ودەمیَ مروڤ ب خاندنا ویَڤە دبورینیت گوت : تڤیا پیَتر ژ نیڤ ساعەتیَ پیَڤە نەبەی لیَ هندەك لدویڤ دیتنا وی نەچوَن وەکی «ویلز» گوت تڤیا 1/4 چارەکەك بیت وهندەك قایدیَ وی لدویڤ ژمارا گوتنا دداتی کو 1500 تا 2000 ووشا بیت ئەڤە لدویڤ دیتنا د . عمر الطالب .. ئوچیروك نڤیسەکیَ عەرەب دبیَژیت :

« چیڤانوك ب فرەنس «cont» چارەسەریا لایەکیَ ژیانیَ دکەت ژبەر هندیَ نەشیَت گەلەك تشتا داریَژیت گەلەك کریارا لجهـ دهیَلیت ودەلیڤا نڤیسڤانی یا تەنگەو کورتە دەبیت یی هوشیاربیت خو قەلس کەت د گوتنادا و کریاریَت دویر وکویر نە وەرگریت خو ب هندە کریاریَت ژیانیَ ڤە مژیل نەکەت دا نە کەڤیتە قوڕی ببیتە لیَ لیَجا پیَت وی ئەڤ نڤیسڤانە « محمد تیمور » ە .

## چەوا پەیدابو .؟ !

یەکەم هەولدان لسەدیَ چاردیَ دوما قەسرا پاپای یامەزن بو لشەڤیَت دریَژ کەس دکاریَت وی خرڤەدبون دەنگوباس ڤەدگیَران باهرا پیَتر ژوان دەنگو باسا وەکی رەنگیَ کورتە چیروکیَ دهات هەمیا پشکداری تیَدا دکر مەزەلکەك بو هندیَ دانا بوَ دگوتیَ « کارگەها درەوا » مەبەستا وان شەڤا خو بەختیار ببورینن ـ یەکەم رویدان ئەو بو یا «پوچیو» ی ڤەگیَرای : « زەلامەکیَ پولونی هەبو دڤیا ژنا خو عیقاب دەت دیت باشترین ئیَشان ئەوە بو ویَ ژنا بوپچ «جیوڤانا» کو نە قوتیت و نە کەتە دەریَ لیَ تولا خو ژیَ بستیَنیت ب ریَکەکا نەپەنی هەلبژارت کو دگەل بژیت وهەر سال بچیکەکی ژیَ چیَکەت تا کو مالا ویَ تژی دبیت پاش بهیَلیت وبچیت لهیَرە ریَکا دینیَ تیَتە گوهورین .

هەوولدانا دوویَ :

ئەوە کو بوکاچیو بیَ رابی و چیروکیَت « ئەلدیکامیرون » نڤیسین هزار شەڤ وهزار کورتە چیروك ـ

پاشي ( موباسان ) هات لنيفا سەدێ نوزدێ ولسەر قايدێ ريالزمي چو وپاشي بويە قوتابخانا نفيسڤانا وەكي [ ئەنتون چيكوف ... كاترين مانسفيلد ... ئەرنست هيمنگواي ... بيراندللو ... ]

**كورتە چيروك چيە ... ؟**

ئەم نا بێژينە وەربـاندنـا رومانەكێ كورتـە چيروك لێ چيڤانوكێ رگێت خو هەنـە و جودايـە بابـەتەكێ سـاغ و بێ كێماسيە بابەتەكێ سەربخوّيە بەريف مەزن وەرار يونێيە يي گريدايە دگەل گەلەك كرياريێت ژيانێ ڤە . لێ نفيسڤان خو لسەر وەختي رادهاڤێت چنكو نەشێت خوّ لزەماني بگريت تا كوكەسان مـەزن ببيت . هەر وەسا گەلەك كريارا دهێليت خوّ لسەر سالا و وەهيڤارا دماڤێت دا زويكا خاندەڤانێ خو بگەهينتە مەبەستێ ژبـەر هندێ تڤيـا كەسـانێت وێ كێم بن دمـەزن بن – پشتي دەستوداريێ سوشيالستي هاتي كرياريێت ئێكانە جهێ خوّ نەما . چنكو پەيسكا ژيانێ بلند بوّ وئەو كريار خزمەتا پالەى و مروڤێ رەنجبە رناكەت .. وقارەمانيا مروڤي تڤيا دگەل كومەلى بيت يا جودا نەبيت – لێ ئەو قارەماني يائێكانەبو وان كەسايە ئەوێت دەست پێكرى و نوى ژيار وزەعيف . ئەو چيـروكێت هاتينـە نفيسـين لسەدێ چـاردێ «ز» يـان چـەرخێ نـاڤنجي بـاسێ پالەوانێي و عەگيداتێي روژ بو روژ بهـاوێ كێم دبيت يابـرە ژ ئاشوبي وبلنداهێي وەكي كاڤانێت چيلاوعـەنتەر وسـوبرمـان وسينـدەبـاد وعـلاء الدين ... » . ئـەڤـەهـەمي هنـدا دبن لدەستوداريێ ئاميرەتي دچەرخێ ئەليكتريكێ دبنە هەلامتە لنك رەوشەنبيرا .

چێكەلەوان تڤيا هەر گوتنەكێ رەمزەك و چهەك هەبيت خورستي بن بێ زێدەهي و بێ مفا مەبن .

**« ئەگەريێت سەركە فتناوێ لسەدێ بيستێ »**

هەلبەت لسەدێ بيستێ بازارا چيڤانوكێ شديا ترە وبسە ركەفتيترە پێش دوستێت خوڤە ژبەر ڤان رەنگا :

1 – روخسار و رێكپێك كرنێ ودەم وسێوەتڤيس

2 – ئەگەريێت دەرڤە و داخبارياوێ .

1 – گەلەك گەنجا خو بێئينـا دەرێ حەژێ كـرلسەر گـراني وزەحمەتێ را چنكو ئەڤ جورە بدەست هەمي كەسـاڤە ناهێت وبسهورى بێ دڤێت دگەل هندێ 70٪ ژنفيسڤانا كەتن .

2 – ئەڤە سەدێ لەزێيە ئاميرەتيو ئەليكتروني هەر روژێب هزاراها گوڤار وروژنام تێنە بەلاڤەكرن ئەو ژى بێويستي پركرنێ نە ژبەر هندێ جهێ كورتە چيروكێ بێهەى ..

هەتا ژلائي ئابوريڤـە مروڤ بـو خودان كـار وكەسپ نەشێت وەختێ خو هەمێ ب رومانێ ڤە ببەت هەر وەسا شول مشەبوّ مروڤ نجوكەتە سەر كارێ لەزێ وسڤكێي .. نوكە كەس حەژ مقاميێت درێژ ناكەت چمكي نەشێت گەلەك ساعەتا پێڤـە ببورينيت لێ مقاميت كورت دێ ب سەركەڤن : وپشتي ئاميرەت شياى دەنگێ مروڤي بگەهينتە كناريێت جيهانێ دەنگو باسێت خوش ڤەگێريت . هەروەسا راديو سەرپشكا ڤان تشتانە راديو نـەشێت درێژە چيـروكێ پەلاڤـە كەت وەخت دەست نـادەت قسەكەر نەشێت پێتر ژ نيڤ ساعەتێ باخڤيت .

تڤيا ژبير نەكەين كول و كەسەريێت مروڤي روژ بـو روژ زێدەبون وئەم دزانين كور(چ) ، مێژيێت ساڤ وزەلال نەماينە كو بشێت درێژ هزرا خوبكەت وب چ تشتێ ديڤە مژيل نەبيت لسەر هوش و بيريێت خوبيت تڤيا ئێ تەنابيت دابشێت هـزرو بيريێت چيروكێ وەرگريت پشكداريێ دگەل كەسانێت چيروكێ بكەت .

د ڤيسا هندە ئەگەر و هويێت كومەلاتي هەنە . ئەو كەسێ پاريێت وى مشەبوين شيا ژيـانا خـو خوش بكـەت دەركەڤيت شـانويـا ببينيت جهێت لارى وخوشێي داخـو ژبيـرڤـەكـەت نەهەوجەيە وەختێ خوّ ژڤەستا ببورينيت لهنداڤي چيروكەكێ دبيت يانەخوش بيت .

ديسا تێكەليا كومەلى وپێوەنديێت كومەلاتي مروڤ پێش كەڤت كهێ تێكەليا كورى كر پشتەكوگريدايا خاني بو چيـروك بخو دخاند ئەڤرو شيا دگەل دەستگرێ خوّ دەركەڤيت . ئاميرەت هاتە پەيداكرن كار سڤك بووورێـژ بو پـالە پێڤە دەخسي بـو . هەمجار مشەبونا مروڤا ل جيهانێ وڤەدانا وان لسەر عەردى دەليڤە كەتە ناڤبەرا جهێ وى وجهێ كارى مروڤێ «ئەوروبى»

نەڤێت وەختێ خو زەعيكەت ، دێ بين هەر ئێكى روژنامەيەك

ـمست دایه تاکو دگەهیته جهێ کاری دەنـگ و باس وکـورته چیروك .

ـنەکەرەکا دی هێژا وبها «روژنامه» روژناما نهو دەست هاڤێته گەرا خو دژیانا مروڤی دا نمازه پشتی رژیمـا تەخـا و قاتـانه ـمرکەتی ناکوکی کەتیه ناڤ‌بەرا وان بوینه پارتێت رامیاری هەر ـپرتەکێ روژنامەیەکامەی دەنگ و باوەریا خو دیار دکەت .

دەسـا تەلفـزیون هـاته مـەیدانێ وێ گـەلەك مـروڤ ـبخوکێشان نـەمازه گـەنجێت تەروونـازك بدیتنا من تلفـزیون ـوژمنێ رەوشەنبیریی‌یه چمکی جهێ هـزرێت قوره .. مخابن خلندەڤـانێ چیروکێ یی‌کێمـه چمکی بسهوری کـەته زانینێ ملموستایێ عنکلیزیێ هایش یی عەرەبیێ‌نینـه یی زبیدەوەرێ هلیش یێ جێغرافیێ‌نینه هەروەسا ..

## - بنکەهێت پێتڤی بونڤیسینا کورته چیروکێ -

۰ –یەك گرتیا هونەری : - داکو چیروك وەربانـدی بیت بێهنا هونەرێی ژێ بهێت پێتڤی یەك‌گرتنـا هونـەریه نڤیسڤـان رەنجا خوَ خرێ بدەته دەقێ کاکلاوێ خو لدور و شوپێت کریاری نه هەلاڤێت تڤیا هەفساری بابەتی بگریت نڤیسڤان لرویڤ پەنوسێ خو نەچیت دەستێ خولێ بگریت .

٢ –تڤیا زور مەبوستاخو ئاشکەرا نەکەت هندە چـەپو چیر تێدابن بشێویادانێ چمکی نڤیسڤان بابەتی ناشروڤەکەت ئـانکو بـوخـانـدەڤـانی بهێلیت مـروڤی مـەرەق ل تشتێ ئـاشکەرانـامینیت هەولدەت خـاندەڤـانێ خـوَ نـەئێختـه کولانتێت تەنگ کو نەشێت ژێ دەرکەڤیت .

٣ –ئەندامێت چیروکا خودانته جهێ وان ب کەیفا خو نەئینیت و ببەت هەر ئێکی ئاخفتنا وی بدەتێ پێچەکێ ژیانا وا یابەرزه روهن‌کەت نەبێژیت یی فەقیر بو یان هەژار بو تڤیا کریار وێ چەندێ دیار کەت .

٤ –تڤیا هەر چیروکێ واتەیەك هەبیت چمکی نڤیسڤان ژیانێ وەردگێریت لدویڤ ژان و کەسـەرێت خوَ تڤیـا مفایێ وێ بوگەلەك دەست‌ودارا بمینیت .

٥ –تڤیا چیروك نەبیته بێلا بانگێ شیدەتا و گوتاربن هەلکولین تیدابیت .

٦ – وەخت لدویڤ کریاری وجهی .

لدویڤ ڤان بنکەها دێ سەحکەینه هندە ستێریت کوردی ل ئاسمانێ کورته چیروکێ هیڤی‌دارم روناهیـەك بیت پوریکـا دلسوژا . کورد هـەر وەکی هەمی میللەتێت جیهـانێ خودان هـونەر وهـونەرمـەندە خـودان کریـارو بیـروبـاوەره گـەلەك نڤیسڤانێت مەشیان ڤان کریارو مێـژو ژیندەرا داریـژن لسەر رەنگێ چیـروکێ وەکێ تورەڤـانێ هێژا پیـره مێـرد ... یـان عەرەبێ‌شەمو .. دیسا علاء الدين سجادی لسەر بەرپـەرێت گوڤارو روژنا ما جهێ خومەبو پاش گـەنجێت پاشـەروژا وان رابون کاروانێ وان گەهاندن وی رێڤه برتا نهو بێ ب رێڤەوچیت وگەلەك برادەر یی ب ڤی تایی رابین وەکی کاك حسين عارف وکال مامەندی ودلشاد محمد امين هەروەسا انور محمد طاهر ورمضـان درويش وفارس عبـدالله حمو ورشيـد فندی ول ڤێ چەندێ مه دەستیری داخو کوهندەك چیووکا ئەم بونمونـه لێ بچین وڤەکولین .

### چیروکا ئێکێ

١ –دچیروکا « سالا ئێکێ ژخاندنێ » برادەر انور محمد طاهر ناکوکیەکێ دئێخته ناڤەبەرا کەڤنه ژیارا کوردەواری وفێل و زانینێت وا رێکا پێشکەفتنێ . گوندڤـان حەژ مـەلا دکەن چمکی لریکا ئاینیو ئولاتی دچین بلا بچیکێت وان بقوتیت وزبارا بێ بکەت قوتابخانه تڤیا نەهیته گوندی . کوڕك یی کو مه ناڤێ وی نەزانی فێری شڤـانێیو کارێ مالێ دچیته نك مەلای دا قورئانێ نیشا بدەت - پشتی قوتابخانه تێته گوندی فرێدکەنه نك سەیدای - نڤیسڤانی قـوتابخـانه بـره ناڤ مناسبی ئەوێ مەلای حرام کری لێ روینشتن سەهـما وی شروڤەکری ئەو هناسب وسەهـما وی دبیته ئاستەنگ دریکا کوڕکی دا قوتابێ د هێلیت .

١ –بـرادەری چاڤێ خـو نەدا ئێـك‌گرتنـا هونـەری « تـوپـز کەنداله » دەست بپایزێ دکەت خو دهاڤێته کڤت وکـویا نەئاشکەرا دچیته کوڕکی تێته دایکێ وسەیدای خاندەڤانێ خوَ تێناکەهینیت کانێ چیروکاوی لدویڤ چ هزره .

2 – چەپ وچیر زێدە کەل ێی دئێخستینە ناف رەمزێت وی تەلیحێت دویرنادەن .

3 – ئەندامێت چیروکێ نەددیارن کورک نزا مەزنە بچیکە دینە هوش مەندە ناڤێ وی چیە ناڤگەلەکە بوقارەمانێ چیروکێ دایکا وی رەنگێ ویێ چیە برادەری کەسانێت خو بدەست ێی دچێ کرینێ هاتن وچون وان ێی د دەستێ ویدا ئەوب خو ناهێن وبچن چ ژمەنەلوژا ناف خودیار نەکریە کورکی چ دڤێت یان چ دبێژیت لدویف وی تەمەنێ ئەندام دگەل کریاری بریڤە ناچن کورک بێ ئاقلە هەر وەسا ما .

4 - واتێ چیروکێ بەلاڤە نزا باسێ زانینێ دکەت یان نەهێلانا نەخویندەوارییێ یان دژی رژیما مەلا یان دهاڤێتە دای وبابێت کورکی یان کورکە یان سەیدایە .؟ چ شیدەت ژێ ناچن نفیسڤانی قوتابخانە برە ناف گورستانێ مروڤ مریا دبەتە وێرێ ئانکو قوتابخانە مرن .

5 - وەخت گوتنا ئێکێ یا کو دبێژن «دەم پایزبو» نەیال جهێ خویە تڤیا ئەم خاندەڤان بزانین دەم کەنگی بو ژخاندنا چیروکی بەلگێت دارا هاتن و چونا خەلکێ گوندی ... هت چنکو نە شانویە .

هەر وەسا دەمێ دبێژیت سەنتور و پەنتوریت وی چ ژێ دهاتن ئەف گوتنە نفیسڤانی یا کریێ کری لسەر زمانێ خەلکێ گوندی چنکو گوندیەژ جلکێت روت ناکەن هەکو دبێژن روت روتەیە ...

## چیروکا دووەم

### یێ تە ڤیا با

د[یێ تە ڤیا با] دا رەمضان درویش چارەسەریا خەبات مانێ و هەلبژارتنا هەڤپشکێ ژیانێ ب رێکا خەونێ برادەرشیا خوقورتالکەت ژ نەهەڤ بەریا کریارێ چیروکێ لڤلڤینا مروڤێت وێ . هندە . راوەستانێت جوان کەم هەنە وەکێ ناڤێ کورکی «داخاز» شێوی وێ ژی کێرهاتیە لێ تڤیا لسەرێ نەگوتبا خاندەڤانی ئەڤتشتە خەونە دامەرەق لێ هەبا هەر وەسا هەمی جارا ئامادەیا بابێ چمکی هەر جارەکێ باب دێ مریت خونە کور نەشێت بژیت .. ؟

## چیروکا سێیەم

د « لومانا » دا سەیدا رەشید فندیخو بلندیا هەفك ئەستورا دپێنگاڤاوان دیاردکەت چەوا کو خاندنێ بهایێ خو نەمایە پشتی پەیدابونا هندە موچەخورا وموقادەلاتا دیسا رێکا مەزاختنا پارا چەوا لسەر سەرێ خورا دهاڤێن ب مەی و گوشتێ وژیانا عولیا .. چەوا کەڤا ژیانێ ژێر دکەن برسی و هەژاریت وەلاتێ خو ژبیر دکەن پارا سەرێ وان فروت وخار ..

## پاشگوتن

بێگومان هەلسەنگاندنەك لڤی بابەتی وڤان ناف ونیشانا ڤە ئو هوسا ب لەز گەلەك تایبێت گرنك هێلیتە ب رێکێ ڤە لسەر هندی را پێویستی دمینیت کو لدویف بچین وپێکولێ بکەین نەهەما پێرادەین نەهەما ئاخافتنەکە لسەر چیروکەکێ یان نفیسڤانەکی . رەنجیا مە لسەر لێچونا چیڤانوکێیە وکا چی هێلایە بومروڤی وچی دانایە بو مانێ و پێشکەفتنێ یان کەڤنەپەریسیێ دریکا چونا ڤی جورە هونەریدا . ڤیچەرخی چەرخێ شورەش و بزاڤێ ناکوکی لناف بەرا راستمالی وهەڤشکیدا . چی کەسێ لێکولینەکێ دکەت بدیتنا شورەشانە دەست پێ بکەت ئانکو ئەو دەقە نەشەرتە فەلسەڤ بیت یان هێفکرینە «تأملي» بیت ب جارەکێ یافەر ئەوە خزمەتا میللەتی تێدا بیت و راگرتنا خەباتا کەسانە وژیانا سەربەست تێدا بخازیت ب گوهورینەکا پێشکەفتی و سەرفەراز ....

ژێدەر

1 — فجر   القصة المصرية يحيى حقي
2 — دراسات في القصة والمسرح   محمود تيمور
3 — في القصة القصيرة   علاء الدين وحيد
4 — فن القصة القصيرة   د . رشاد رشدي
5 — مجلة الثقافة الجديدة
في الفن الروائي والرواية الجديدة ، د . خالد عبدالسلام
6 — الرواية والقصة القصيرة   عبدالرضا علي
7 — الواقعية في الادب الكردي   د . عز الدين مصطفى رسول
8 — روژناما هاوکاری   ژ 443 . 430 . 420

# له ئەرشیفی دەستنووسێکەوە

● ابراهیم احمد شوان ●

هەموو میلەتێك لەم جیهانەدا ئەدەبێکی تایبەتی خۆی هەیەو خاوەنی فۆلکلۆرو کولتووری خۆیەتیو مۆرکێکی وای پێوەیە کە دەتوانرێ لە ئەدەبی میللەتانی دی جودابکرێتەوە .

بەلام لێرەدا هەموو میللەتێك وەکو یەك سوودی لە گەنجینەی شاراوەی فۆلکلۆرو بەرهەمی ئەدیب و نووسەرەکانی وەرنەگرتوە یاخود بۆی نەلواوە کۆیان بکاتەوەو لە فەوتان رزگاریان بکات . یەکێ لەوانە میللەتی کوردە کە بە هەزارەها زاناو بلیمەتی پێگەیاندووەو دەستێکی بالایان هەبووە لە هەموو بوارەکانی ئەدەبی ئەو چەرخەی کەتێیدا ژیاون . خۆ ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە بەهیچ جۆرێ سوودمان لە کولتووری کۆنمان وەرنەگرتوە ، بەلکو بەهۆی دلسۆزانەوە بەشێکی باشی قورتارکراونو تەپوتۆزی دەلاقەکانی لەسەر لادراوەو گەیاندراوەتە بەر دەستی خوێندەواران .

هۆی لە ناوچوونی زۆربەی سامانی ئەدەبی پێشوومان دەگەرێتەوە سەر ئەو بارە ناهەموارانەی کە بەسەر وولاتەکەماندا هاتوەو هەر چەپۆکێ راوەشێنرابێ یەکسەر بەبناگوێی کەوتوەو سامانی ئەدەبی ئەوسای لەناوچووە . هۆی دووەمیشی کورد زۆربەیان نەخوێندەوار بوونەو هێندە گرنگیان بەدەستنووسو شیعری شاعیران نەداوەو مشووری کۆکردنەوەی بەرهەمەکانیان نەخواردووە .

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە حوجرەی فەقێو مەلایەکان تاکە مەلبەندی رۆشنبیری ئەوسای میللەتی کورد بووە ، سەرەرای ئەوەی کە خوێندنی سەرەکی لەو حوجرانەدا ئیسلامی بووە . کەچی رێی لەفەقێو مەلایەکان نەگرتووە کە ببنە هاودەمی شیعرو شاعیری وایان لێهەلکەوێت کە شیعرەکانیان ببێتە وێردی سەرزاری خەلکیو بەزۆربەی کوردستاندا بلاوببێتەوە ، لەو حوجرانەدا بەهرەی بەرز هەلکەوتووەو تخووبی خوێندنی ووشکی ئەوسای بەزاندووە . هی وایان هەبووە کەلە شاعیر بووەو هەندێکیشیان بەتاكو تەرا شیعری ووتووەو جاروبار ئەسپی خۆی تاوداوە .

باهێندە لەسەری نەرۆمو درێژەی پێنەدەم ، لەم رۆژانەدا چاوم بەیەکێ لە کتێبە دەستنووسەکانی کتێبخانەی باوکم کەوت کەناوی ( شرح سعد الله الکبیر ) ەو لەسالی 1277 ی کۆچی نووسراوەتەوە بەدەستخەتی [ احمد عبدالعزیز محمد بەردەرەشی ] کە خەلکی شاری بانەیەو نازناوی شیعری ( محزون ) ە ، لەپێشەکی ئەم کتێبەدا شیعرێکی کوردی نووسیوە کەبریتییە لە (20) دێرو بەخەتێکی فارسی نووسراوە ، منیش پاش خوێندنەوەی پیشاندانی شیعرەکە بەمامۆستا ( محمد نوری ) توانیم کە بیخوێنمەوە ، هەرچەندە کە لەیەك دوو جێگای لەنگی دەنوێنێ بەلام چۆن بووە ئاوام نووسیوەتەوە هەر وەکو لە روونووسەکەیدا بەدیار دەکەوێت ، ئەمەش دەقی شیعرەکەیە بەرێنووسی ئێستا : ـ

**عەزیزەکەم ، دیدەکەم قوربانی تۆبێ**
**عیلاجێك ، دەستی من دامانی تۆبێ**

- خەتای من نیە ... جووتە پێلاوێکی ئێستا دوو ئەوەندەی پەردی جارانی تێ دەچێو هەر بێسوودیشە . بازرگانەکانی جاران پیاوو موسلمانو خاوەن ویژدان بوون ... شتی چاك نەبوایە نەیان دەهێنا ... بەلام ئەمرۆ کەس گوێ ناداتێ ... پێستەکان خراپو رزیون من بلێم چی ...؟ .

دایكو کورو خاوەن کوگاو پێلاو درووو هەموو پێکەوە چوونە لای بازرگانی پێستە فرۆشو لێیان پرسی

- بۆ چەرمی خراپو رزیو دەفرۆشی ... ؟!

بازرگانی چەرم فرۆش وەلامی دایەوە :

- کام بازرگان پێی خۆشە توخمی خراپ بفرۆشێ ؟ بەلام چبکەم ... زەمانە خراپ بووە ... خووو رەوشتی خەلکی هەموو گۆراوە ... خەلکی ئێستا ویژدانو رەوشتو پیاوەتی یان لەبیرچۆتەوە ... تا ئێستا سەرم بەچەند کارخانەی چەرم دروست کردندا کردوە ، هەموو هەر چەرمی خراپو رزیوە دروستی دەکەن .

دایكو کورو خاوەن کوگاو پێلاو درووو بازرگانی چەرم تێکرا چوونە لای خاوەن کارخانەی چەرم دروست کردنو لێیان پرسی

- بۆ پێستو چەرمی خراپو رزیو دروست دەکەن ؟

خاوەن کارخانە وەلامی دایەوە :

- ئێوە راست دەفەرموون ، بەلام من چبکەم ، ... خەتای من نیە ... زەمانە خراپ بووە .

دایكو کورو خاوەن کوگاو پێلاو درووو بازرگانی چەرمو خاوەن کارخانە ، چوونە لای لێپرسراوی کوشتارگا ( مجزرە ) و لێیان پرسی :

- بۆ پێستەکان بەچاکیو ساغی ناگرون ؟!

لێپرسراوی کوشتارگا وەلامی دایەوە :

- من بلێم چی ؟ لەم سەردەمەدا نەك تەنیا خووو رەوشتی خەلکی بەلکە خووو رەوشتی (گا) یەکانیش هەر گۆراوە ... خۆ من پێستی خۆمتان پێ نافرۆشم ... ئەوە گایەکانن پێستەکانیان خراپ بووە !.

هەموو پێکەوە چوونە گەوری (گا) یەکان ... لێپرسراوی کوشتارگا هەوساری گایەکی گرتو ووتی :

- ئەی (گا) ... ئەوە تۆ تەریق نابیتەوە ، نابرووی من لەلای ئەم هەموو خەلکە بەرێزانە دەبەی ؟! لەنێو چەوانی تۆی (گا) وە هەرچی بە دەمیاندا هاتووە پێیان کردووم ... جاران پێستی ئێوەی گاگەل پتەوو توندو جیرو چاك بوو ... ئەدی ئەوە بۆ ئێستا وا خراپ بووە ... ها ؟!.

(گا) ی بەستەزمان ملی کەچ کردو وەلامی دایەوە :

- ئێمەی گاگەل هەندووکە خەتامان نیە ... ئێمە لەبەرامبەر ئادەمیزاددا کە خاوەنی پێستو گۆشتی ئێمەن چ دەسەلاتێکمان هەیە ... گوناه گوناهی خۆتانە . ئەو کاو جۆیەی کە خاوەنەکانمان دەماندەنێ نیوەی زیاتری گلو خۆلە ... بەو ئالیکەش پێستو گۆشتی ئێمە لەمە باشتر نابێ ... ئێمە گوناهمان چیە .. برۆن خووو رەوشتی خۆتان بگۆرن -

هەموو دەردەدارەکان لە پێشەوەو ( گا ) ی بەستەزمانیش بە دوایانەوە کەوتنە رێو چوونە لای خاوەن « گا » و لێیان پرسی :

- بۆ کاوجۆی خاوێنو ئالیکی باش نادەی بە گایەکان ، تا پێستو گۆشتیان وەکو جاران ساغ بێنەوە ؟!

خاوەن گا وەلامی دایەوە :

- راست دەفەرموون ، بەلام من بێگوناهم .. ئەوە هەمووی خەتای ئەو ( کاکەحمەد ) ە بێشەرمو نابرووو چاوچنۆکەیە کە خاكو خۆلو ووردە بەرد تێکەلی کاوجۆیەکەی دەکاتو بە ئێمەی دەفرۆشێ ... ئەم دەستەیە هەموو پێکەوە لەگەل خاوەن گاو « گا » یەکەدا پێکەوە چوونە لای « کاکەحمەد » و لێیان پرسی :

- بۆ گلو خۆلو ووردە بەرد تێکەل کاوجۆ دەکەی ؟

کاکەحمەدیش هەر وەلامەکەی ئەوانی دووپات کردەوە :

- من بلێم چی ... خووو رەوشتی خەلکی گۆراوە ، زەمانە تێکچووە ... جاران جووتە پێلاوێکم دوو سێ سال لەپێ دەکرد ، بەلام ئەمرۆ دوو سێ مانگیش ناکات !.. ئەك هەر پێلاو ... پۆشاك ... خواردن ... خانوو ... دەرمان ... هەموو شتێك هەرگران بووە ... منیش بۆ دابینکردنی ژیانی ژنو مالو مندالم ناچارم بکەومە فرتو فێلان ... چبکەم ، زەمانە گۆراوە - نابرووو ویژدان نەماوە !.

دەردەدارەکان هەموو تێکرا سەیرێکی یەکتریان کردو بەسەر بادانەوە دەستیان بۆ قسەکانی کاکەحمەدی لەملداو تەنانەت ( گا ) یە بەستەزمانەکەش چەند جارێکی سەر بادا .



نووسینی ـ چیکۆف

د. هیوا عمر احمد

لە ئینگلیزییەوە وەریگێڕاوە

ئـۆلێنکـا پلیمینیـاکـوف ، کـە کچی یـاریـدەدەریکی کارکەنـاربوو ، لەنـاو جۆلانـەی باغچـەکەیـان دانیشتبوو سەرمەستی بیرکردنەوە بوو . هەواگەرم بوو ، مێش و مەگەز پەستیان کردبوو ، بەلام شتێکی خۆش بوو کە مرۆڤ بیری لەوە ئەکردەوە تۆزێکی تر ئەبێ بەئێوارە . هەورە بارانی یە ڕەشەکان ئاسمانی ڕۆژ هەلاتیان تەنی بوو . شنە بایەکی شێدار هەلی کرد .

کوکین ـ کە بەرێوە بەری شانۆ بوو ، کرێچیان بوو ، لە نـاوەڕاستی باغچـەکەدا ڕاوەستـابوو ، چـاوی لە ئـاسمـان بڕیبوو . لەبەر خۆیەوە ووتی ـ [دووبارە ، دووبارە ئەبارێت هەموو ڕۆژێ ئەبێ ببارێ ، ئەمە ئەبێتە هۆی هەرەس و مردنم ئەبێ هەموو ڕۆژێکم وا بە فیڕۆ بڕوات] .

دەستی دا بە یەکاو قسەکەی تەواو کرد ووتی ـ

ـ [ئـۆلینکا ، ئـەمە ژیـانی ئێمەیـە ، هێندە بـەسو گـوارە ئەتگرێنێ . تۆ وەرە ئیش بکەو شـەونخونی بکێشـەو مێشکت ماندوو بکە چیت لەدەست دێ بیکە بۆ ئەوەی شتێکی باشتریان پێشکەش بکەی . ئەمەش ئەنجامەکەی بێ ، جارێ پشت گوێت ئەخەن باشترین ئۆپێرام پێش کەش کردن ، کۆمەلێکی لێهاتوو هونەرمەندی کارامەم خستنە کار ، بەلام ئەوانـە شتی وایان ناوێ ، نەخێر ، ئەمـە لە ژووروو ئاستی ئـەوانەوەیـە شتێکی بێ مانای وایان ئەوێ ، پێی ڕابوێرن . ئای هەموو ئێوارەیەك ئـەبارێ دەستی کـردەوە بە بـارین ، لە ڕۆژی دەی مـانگی پێنجەوە ئەبارێ وا ئەمڕۆش ناوەندی مانگی شەشە . بەڕاستی بەڕاستی جێی خەفەتە ، گەرچی کارم وەستاوەو جەماوەر ڕوو ناکەنـە شانـۆ پێویستـە من هەر کـرێی خۆم بـدەم و پارەی هونەرمەندەکانیش مسۆگەر بکەم .] .

سبـەینێ لە دەوروو بـەری ئێـوارەدا ، تـەم ئـاسمـان ئەگرێ و ـ کوکین ـ یش بە پێکەنینێکی هستیریەوە ، ئەلێ :

ـ [باشە ، ببارێنە ببارێنە ، باخچەکەم لێ بکە بـە گۆمـاو ، منیش بخنکێنە ، بەڕاستی بەد بـەختم لەژیاندا . پاش ئەمە چی ئەبێ ؟ ، با هونەرمەندەکـان لێم وەرس ببن و بە بـەندیم بکەیەن و بم نێرن بۆ [سیبریا] بۆ [سکافۆلد] ، ها ها ها] .

بۆ ڕۆژی دوایی ، هەمان شت ڕووی دایەوە . ئۆلینکا ، بـەبێ دەنگی یەوە گـوێی لە کوکـین ، ئـەگـرت . زۆر جـار چاوەکانی پڕ ئەبوو لە فرمێسك . لە ئەنجامدا ئەم بێبەختی یە



حوولاندی‌و وای هەست ئەکرد ، کۆکـین ـ ی خۆش ئـەوێ . ئەویش کابرایەکی کورتە باڵای لاوازی دەم‌و چاو زەردو رواز بوو . کە قژی شانە ئەکرد گوێ‌ی دائەپۆشی . دەنگی نـاسك بوو ، کە قسەی ئەکرد ، لێوی زۆر ئەبزوا . خـەم‌و خەفـەت لەدەم‌و چاوی ئەباری . شتێکی لە کیژەکەدا زیندوو کردەوە ، هەستێکی یەکجـار قوڵبـوو . ئۆلینکـا نـەیئـەتـوانی بـەبێ خۆشەویستی بژی ، لە سەرەتادا باوکی خۆش ئەویست ، بەڵام ئێستا نەخۆشەو لە کورسی‌یەك دا لە ژوورێکی تـاریك‌دا مـات بـووەو بە گـرانی هەنـاسەی بـۆ ئـەدرێ . پـاشـان پوری خۆش‌ویست ، کە ساڵی جارێك لە [بریانسك]ەوە ئەهات ، پێش ئەویش ، کاتێ کە ئەچوو بۆ قوتابخـانە ، مـامۆستـای زمانی فەرەنسی خۆش ئەویست ئافرەتێکی لەسەرخۆو بە بەزەیی بوو ، دڵێکی بە پەرۆشی هەبوو . چاو نەرم‌و تەندروست‌بـوو ، کوڵم ئاڵ‌و گوپن بوو .

مـلی نەرم‌و سپی ، نیشـانـەیـەکی رەشی پێـوە بـوو . زەردەخە نەیەکی پڕ لە بەزەیی دەم‌و چاوی رۆشن ئەکردەوە ، بە تایبەتی ئەو کاتانەی گوێ‌ی بۆ شتێکی خۆش ڕائەدێرا . ئەو پیاوانەی دیبوویان ، بەدەم زەردەخەنەوە ئەیـان ووت [شتی چاکە] . ئافرەتانیش ، ئەیان دواندو بە خۆشی‌یەوە ئەیان ووت [نازیز] . ئەو خانووەی هەموو ژیانی تیا بردبووە سەرو بەپێ‌ی راسپاردەی باوکی بووە هی ئەم ، کەوتبووە کەنار شار ، لەنزیك [ڕێ‌ی قـەرەجان]ەوە ، زۆر لە [تیفـۆلی]یەوە دوور نـەبوو . ئێوارەو شەوان گوێ‌ی لە دەنگی شانۆو ئەو ڕۆکێتانە بوو بەرەو ئاسمان دەر ئەچوون .

ئاگاشی لە کۆکین ـ بوو کەوا بەگژ چارەنووسی خـۆی‌دا ئەچوو . وە جنێوی بە دوژمنەکەی ئەدا ، کە جەماوەری شانۆ بوو . گوایە ناهوشیارن . کیژەکە دڵی بـە پەرۆشـەوە بۆی لێ ئەدا ، کە ئەو لە بەرەبەیان‌دا ئەگەڕایەوە ، لای پەنجەرەکەی ئەگرت‌و لە درزی پەردەکانەوە ، دەم‌و چاوو شـانێکی پێشان ئەداو زەردەخەنەیەکی هارمۆنی بۆ ئەگرت . ئەویش ڕازی دڵی خۆی بۆ درکاندو بەرێوەن کە وا ببنە هاوسەر . کاتێ لە نزیکەوە لەمل‌و شانە خرپنەکانی وورد بـووەوە ، دەستی دا بە یـەکا ووتی ـ [نازیز] .

کۆکین ـ بەختەوەر بوو ، بەڵام باران ئەباری‌و تەنانەت لە ڕۆژو شەوی زەماوەندەکەشیان‌دا باری ، بووە هۆی ئەوەی مۆرکی خەم‌و خـەفەت لەدەم‌و چـاوی نەبێتـەوە . وەکو دوو هاوسەر بەخۆشی ژیانیان بردە سەر . کەوتە ئەوەی خەمی کاری مێـردەکەی بخـوا پۆستـەی بەسـەر ئەکـردەوەو چاودێـری باخچەکەیانی ئەکردو قـەرزەکانی ئـەدایەوە . کـوڵەکـانی ، زەردەخەنە خواکردەکەی وا لە پەنجەرەی پۆستەدا دیارە . یان لە لایەکی شانۆوە دائەنیشت یان لە چیشتخانە ئەبینرا . لای هاوڕێکانی ئەیووت ـ [شانۆ یەکجار مەزنە ، زۆر گرنگە ، زۆر

زۆر شتێکی پێویسته له ژیان‌دا . ته‌نیا شانۆیه‌که بتوانی شادی راسته‌قینه ببه‌خشێ و وات لێ‌بکا ، شارستانی‌و مرۆڤ په‌روه‌ر بیت] . له‌خۆی ئه‌پرسی [به‌لام تۆ بڵێی خه‌ڵکی له‌مه تێ‌بگـا ، ئـه‌وان شتێکی گاڵتـه جاڕیـان ئه‌وێ . دوێنێ [فـاوست] مان پێش‌کـه‌ش کـردن ، بـه‌لام کـه‌س نـه‌هـاتبـوو . زۆر بـه‌ی کورسی‌یه‌کان به‌تاڵ بوون . به‌ڵێ ئه‌گه‌ر ئێمه شتێکی لاوه‌کی‌و بێ‌نرخمان پێش‌که‌ش بکردایه ، ئه‌وا شانۆکه یه‌کێکی تری نه ئـه‌گرت . بـه‌یانی [ڤـانیکا] و من ، [ئـۆرتوس له دۆزه‌خ] دا پێش‌که‌ش ئه‌که‌ین] .

مێـرده‌که‌ی هـه‌رچی‌یه‌کی ئـه‌ووت له‌بـاره‌ی شـانـۆو هونه‌رمه‌ندانه‌وه ، ئه‌م ئـه‌یووتـه‌وه . ده‌ستی خسته پیشـه‌ی مێرده‌که‌یه‌وه ، ڕه‌خنه‌ی له خه‌ڵکی ئه‌گرت له‌باره‌ی پشت‌گوێ خستن‌و نه‌نرخاندنی هونه‌ره‌وه . هونه‌رمه‌نده‌کانی ڕێك ئه‌کردو چاودێری مۆسیقای ئه‌کرد ، ئه‌گه‌ر بهاتایه یه‌کێ له‌ڕۆژنامه‌کان ڕه‌خنه‌ی لێ بگرتنایه ، ده‌ستی ئه‌کرد به گریان‌و ئه‌چـووه لای سه‌رنوسه‌ره‌که‌ی‌و له‌گه‌ڵیا ئه‌دوا . هونه‌رمه‌نده‌کان خـۆشیان ویست‌و پێ‌یان ئه‌ووت [ ئازیز ] جارجاره‌ش [ ڤـانیکاو من ]

زۆر به‌په‌رۆش بوو بۆیان ، دیاری‌ی بچوك بچوکی ئـه‌دانی ، ئه‌گه‌ر له‌گه‌ڵیا تێك بچوونایه ، ئه‌گریا ، ڕێکی ئه‌کردنه‌وه ، به‌لام سکاڵای لای ڤانیکا نه ئه‌کرد . ئه‌م جووته زستانیشیان به خۆشی به‌سه‌ر برد ، شانۆ که‌یان دایه ده‌ست کـه‌ژو ماوه‌یـه‌ك دایان خست‌و چوون بۆ ـ ئۆکریا ـ . ئۆلینکا ، به‌م شادی‌یه گۆشتی گرت ، به‌لام کوکین ـ تا ئه‌هات لاواز ئه‌بوو ، ده‌م‌و چاوی چه‌قتر ئه‌بوو ، گله‌یی له چاره‌نووسی خۆی ئه‌کرد . شه‌وانه ئه‌کۆکی، ئه‌ویش چایه‌کی گژوگیای کێویله‌ی بۆ ئه‌کردو به ئاوی قوله‌نیا ئه‌یشێلاو له به‌تانی گه‌رم‌و نه‌رمی ئـه‌پێچا . له‌سـه‌ر خۆو بـه ئاسپایی ده‌ستی به قژیا هێناو ئه‌یووت ـ [مێرده‌که‌م] ، چه‌نده شیرینی] .

کوکین ـ چـوو بۆ مـۆسکۆ بـۆ مامـه‌ڵه کردن تـا له‌گه‌ڵ کۆمپانیایه‌کی [ئۆپێرا]دا ڕێ‌بکه‌وێ بۆ کاری هاوین . ئۆلینکا خه‌وی لێ نه‌ئه‌که‌وت له په‌نجه‌ره‌کا دانیشت‌و که‌وته ئه‌ستێـره ژماردن . زۆر شتی له مریشك ئه‌چوو ، هه‌ردووکیان شه‌وانه نه ئه‌خه‌وتن‌و خه‌م‌و خه‌فه‌ت دایان ئه‌گرێ که که‌ڵه‌شێره‌که له‌ماڵ نه‌بێ . کوکین ـ دواکه‌وت ، نامه‌یه‌کی بۆ نارد که گوایه له ڕۆژی پشوودا ئه‌گه‌ڕێته‌وه . له نامه‌کانیا باسی (تیڤۆلی) ئه‌کرد . به‌لام ڕۆژی دووشه‌مه ، له هه‌فته‌ی پیرۆزدا ، ئێواره‌یه‌کی دره‌نگ له ده‌روازه‌که‌یان‌دا ، (ته‌پ ، ته‌پ ، تـه‌پ) وه‌ك به خێـرایی له به‌رمیلێك بـده‌ی . چێشتکه‌ره‌کـه‌یان بـه‌پێ‌ی په‌تی‌و چـاوی خه‌واڵووه وه ، به دالانه‌کا ڕایکرد ده‌رگاکه بکاته‌وه .

- [تکایه بیکه‌ره‌وه ، بروسکه‌یه‌کتان بۆ هاتووه .]

ئۆلینکا ، بروسکه‌ی تری بۆ هاتبوو ، به‌لام ئه‌مجاره‌یان ترساو دڵی گـوشرا ، بـه‌ده‌ستی له‌رزۆکه‌وه ، بـروسکه‌کـه‌ی کـرده‌وه ، ئـه‌مـه‌ی تیـادی ـ [ئیڤـان بیتـراڤیـچ ، ڕۆژی سێ‌شه‌ممه ، له کاتی چاوه‌ڕوانی ووتووێژدا کتوپڕ مرد] .

له‌لایه‌ن لێپرسراوی کۆمپانیای ئۆپراوه هاتبوو .

به‌ڕاستی له‌ده‌رگادانه‌که دڵی‌دا خورپان ، ئـه‌م هه‌واڵه وه‌ك کسپـه‌ی له هه‌نـاوی هه‌ڵسـان . له‌به‌ر خـۆیه‌وه ووتی ـ [خۆشی دڵه‌که‌م بووی ڤانیکا ، دیده‌کانم بۆچی تۆم بینی‌و تۆم ناسی‌و خۆشم ویستی ، له دوای تۆ ئه‌م ئۆلینکا هه‌ژاره ، ناشاده دڵ به‌کێ خۆش‌کا] .

کوکین له ڕۆژی سێ‌شه‌مه‌دا له گۆڕستانی (ڤاگانکۆڤ) له مۆسکۆ نێژراو بێوه‌ژنه‌که‌ی ڕۆژی دوایی گـه‌ڕایه‌وه مـاڵه‌وه . نه‌یئه‌توانی سه‌ربکات به‌و ژووره‌دا که یادگاری ئه‌وی پێوه‌بوو . خۆی کوتایه سه‌ر جێگاکه‌و ده‌ستی کرد به گریان‌و لاواندنه‌وه به‌ده‌نگێ له‌شه‌قام‌و باغچه‌ی هاوسێ‌کانی‌یه‌وه ئه‌بیسترا .

دراوسێکان که هاتن بۆ لای ، نیشانه‌ی خاچیان ئه‌کێشاو ئه‌یان ووت [ئازیز ، به‌ڕاستی ئافره‌تێکی به‌سته زمانی] .

سێ‌مانگ دواتر ، که له کڵێسه ئه‌گه‌ڕایه‌وه ، تاك‌و ته‌نیا به خه‌مباری‌و خه‌م‌و خه‌فه‌ته‌وه ڕێ‌ی ئه‌کرد ، [فازیلی ئـه‌ندیـچ پـۆستۆ ڤـالۆڤ]ی دراوسێ‌ی ، کـه بـه‌ڕێـوه‌بـه‌ری یـه‌کێ له باغچه‌کانی ده‌ورو به‌ری‌بوو ، هاته ته‌نیشتی‌و ده‌ستی کرد به دواندنی .

تـه‌پله‌یه‌کی پـووشی له‌سه‌ردابـوو ، ساقـۆیـه‌کی سپی له‌به‌ردا بوو ، کاتژمێرێکی زێڕی زریزه‌داری له‌به‌ر بـاخه‌ڵ‌دا

بوو . زیاتر لە خاوەن زەوی ئەچوو وەك لە کابرایەکی کارگێر . بە دەنگێکی پڕ بەزەیی و هێمن کەرەوەوە ووتی - [لەم جیهانەدا ، هەموو شتێ سیستەمی تایبەتی خۆی هەیە ، ئۆلگا سیمینۆڤا . ئەگەر کەسێکی زۆر خۆشەویستمان ڕۆیشت و نیاچوو ، ویستی خوای لەسەرە . پێویستە حەوسەلەمان هەبێ و ئەو یادگارە ناخۆشە لەبیر دەرکەین] .

کە گەیشتە دەروازەکەیان ، کابرا پارەتی ڕۆیشتنی لێ خواست . هەموو ئەوڕۆژە ، دەنگە خۆشەکەی لەگوێی دائە زرنگایەوە . کە چاوی نوقاندو ڕیشە ڕەشەکەی هاتەبەرچاو ، زۆری چووە دڵەوە . بێگومان ئەویش کاری تێکرابوو . زۆری نەبرد پیرەژنێکی ناسیاوی هاتە میوانی ، هەرکە دانیشت باسی کابرای کرد - [کابرایەکی ڕێك و پێك و بەهێزە ، هەموو ئافرەتێك حەز بە هاوسەری ئەکات] .

سێ ڕۆژ دواتر خۆی هات بە میوانی ، تەنیا دە خولەك دانیشت ، کەمیش قسەی کرد . بەڵام چووە دڵی ئۆلینکاوە ، بە قووڵی کاری تێکردبوو . ئەو شەوە وەك تادارێ خەوی لێ نەکەوت . بەیانی ناردی بەشوێن پیرەژنەکەدا .

زۆری پێ نەچوو شیرینی خورایەوەو زەماوەند کرا . وەك دوو هاوسەر ژیانیان بەڕێکی و شادی ئەبردە سەر . هەموو ڕۆژێ پاش نانی نیوەڕۆ کە لە باغچەکە ئەچووە دەرەوە بۆ ئیش و کار ، ئۆلینکا شوێنی ئەگرتەوەو تا ئێوارە ئەمایەوە تا چاودێری کاروباری مێردەکەی بکات . بە مامەڵە کەرانی ئەووت - [سەیرکەن ئێمە هەموو ساڵێ لەسەدا بیستی خەرجی ساڵی پێشوو زیاتر ئەدەین بە تەختە ، جگە لەوەی ئەبێ (فازیکا) بچێ بۆ ئەم لاو ئەولاو مەترسی ڕێی دێتەبەر] . دەم و چاوی بەلەپی دەستی داپۆشی و ووتی [تەنگو چەڵەمەو مەترسی ڕێگاش لەولاوە ڕاوەستێ] .

وای هەست ئەکرد ئەوەتی هەیە ، هەر بەتەختە فرۆشی یەوە خەریکە . وای ئەزانی تەختە فرۆشی لەهەموو شتێکی جیهان گرنگترو پێویستترە . زۆر شتی زیندوو ناسکی تیا دۆزییەوە وەکو گورزە ، کۆڵەکە ، ڕایەڵ ، تەلاش ، سندوقی تەختە ، هەڵگر ، پارچە تەختە . شەوانەش خەوی بەشاخەکانی (ئوردو پلانگ)ەوە ئەدی ، کاروانی لەژمارە نەهاتووی ئەدی ، کە لە شارەوە تەختەیان هەڵئەگرت و ئەیانبرد بۆ شوێنە دوورەکانی جیهان . خەوی بەوە ئەدی کە سیستەمی گورزە [28 پێ بە 8 گرێ] ، زۆر ڕێك و پێك و ئەوپەڕێتی . خەوی بەوەوە ئەدی کە لە حەوشەی تەختە فرۆشی‌یەکەیاندا پیاسە ئەکاو ئەبینێ گورزەو تەلاش و پارچە تەختەکان بەیەکدا ئەدرێن و بەرز ئەبنەوەو لە شوێنی خۆیان مت ئەبنەوە . دەنگێکی ڕەقی وەك پیاکێشانی تەختەی ووشك دروست ئەکەن . دەم و چاو گرژئەکاو مێردەکەی لێی ئەپرسێ - [چیتە ئازیز ، نیشانەی خاچ دروستکە]

مێردەکەی چی ئەووت ئەمیش ئەیووتەوە . وەکو بیروڕای خۆی ، بۆ نمونە ئەگەر مێردەکەی وا هەستی بکردایە ژوورەکە گەرمە ئەمیش واهەستی ئەکرد ژورەکە گەرمە . ئەگەروای هەست بکردایە ئیش و کار کزو هێواشە ، ئەمیش واهەستی ئەکرد .

مێردەکەی حەزی لە گەڕان نەبوو ، ڕۆژانی پشوو لە ماڵەوە ئەمایەوە ئەمیش لە ماڵەوە ئەمایەوە . خەڵکەکە پێیان ئەووت [تۆ هەمیشە یان لە ماڵەوەی یان لە سەر تەختە فرۆشتنی ، ئەئەچی بۆ شانۆ نەبۆسێرك ، بۆچی ئازیزەکەم] .

ئەمیش وەڵامی ئەداتەوە و بەهێمنی‌یەوە ئەیووت - [فازیکاو من ، سەرقاڵین کاتمان نی‌یە بەشتی پڕوپوچی وەك شانۆوە بە فیرۆی بدەین . شانۆ چ سودێکی هەیە] .

ڕۆژی شەموان ئەچوون بۆ سەرژمێری ئێوارانەو ڕۆژی پشووش ئەچوون بۆ کلێسەو پێکەوە شان بە شانی یەك ئەگەڕانەوە ، شادی لەدەم و چاویان ئەباری . بەیەك قایل‌بوون . جل‌وبەرگی ئاوریشمی ورشەداری لەبەرئەکرد . لە ماڵەوەش نان و چاو زۆر جۆر مرەبایان ئەخوارد ، پاشان ئەکەوتنە نۆك خواردن . هەموو ڕۆژێ لە نیوەڕۆدا ، لە حەوشەکەیاندا یان لە بەردەروازەکەیان ، یان لە سەر کاربۆنی خۆشی (بۆرش) ئەکرا ،! ئەوەش ئەبوایە بۆنی (ڕۆست)و مراوی ئەکرا ، ڕۆژانی جەژنیش بۆنی ماسی ئەهات . کەس نەبوو بەلای دەروازەکەیاندا تێپەڕێ و دەمی ئاو نەکات . لە

سەرکارکردنیش هەمیشە سەماوەرەکەیانێ گیزەی ئـەهات ، مامەڵەکـەرانیشیان بـانگ ئـەکرد بـۆ چاخـواردن ، چەرەس خواردن .

هەفتەی جارێکیش ئەچوون بۆ گەرماو ، شانبەشـانی یە ك ، بەدەمو چاوی سور هەڵگەڕاوەوە ئەگەڕانەوە .

ئولینکا ـ بە هاوڕێکانی ئەووت ؛ ـ [هـەموو کـارێکمان سازە ، سوپاس بۆ خوا ، ئاواتـەخوازم هـەموو کـەسێ وەکو [فازیکاو من بە ختەوەربن] .

کاتێ فازیکا چووە دەرەوەی شار ، بۆ تەختەفـرۆشی ، نامۆیی ئەکرد ، شەو خەوی لێ نە ئەکەوت و ئەگریا ].

هەندێ ئێـوارانیش [سمیرنـین]ی کرێ چیـانی بانـگ ئەکردە لای خۆی ، ئەویش بە یتاڵێکی سەربازی گەنجبـوو . ئیتر پێکەوە یاریان ئەکردو نامۆیییەکەی ئەشکا . دڵی خۆی بۆ ئولینکا ئەکردەوە ، بـاسی خۆی بـۆ ئەکـرد ، ژنی هێنابـوو ، کوڕێکیشی هەبوو ، بەلام لە ژنەکەی جیا بووبووەوە گوایە لەبەر خانەگومانی . ئێستا ڕقی لێیەتی . بەلام هەمـوو مانگێ چـل (ڕوبڵ)ی بۆ ئەنێرێ تا کوڕەکەی باشی بەخێوبکات ئولێنکا گوێی لێئەگرت و جارجارە هەناسەی هەڵ ئەکێشاو سەری بائەداو بـۆی بە داخـەوە بوو . پێی ئـەووت [باشـە ، خوا بتپارێزێ] .

کاتێ ئەیانکرد بە شەو ، تاکو پێپلیکەکان بە مۆمێکەوە لە گەڵی ئەچوو ، پێی ئەووت [سـوپاست ئـەکەم نـامۆیـەکەت شکاندم ، هیوادارم تەندروستیت باش بیت] . هەموو جـارێ بەم شێوەیە وەکو لاسایی میردەکـەی بکاتـەوە ، بە هێمنیو ژیرییەوە هەڵس و کەوتی ئەکرد . کە بەیتاڵەکەش دەرگاکەی لە دوای خۆیەوە پێوە ئەدا ، بانگی ئەکردو ئەیوت [فلا دیمـێر ، ئەزانی باشتر وایە ژنەکەت ئاشت بکەیتەوە ، لێی ببوورە هیچ نەبێ لەبەر منالەکەت من دڵنیام ئەو منالە لە هەمووشتێ ئەگاو ئازاری پێ ئەچێژێ] .

کاتێ فازیکا گەڕایەوە ، بە دەنگێکی نەرم هەمووشتێکی بۆ گێڕایەوەو باسی ناشادییەکەی بـۆ ئەکـرد ، هەردووکیـان ئاهیان هەڵ ئەکێشاو سەریان بائەداو باسی منالەکەیان ئەکرد کە چۆن نامۆیی باوکی ئەکێشێ . وەکو بیری یەکتر بخوێننـەوە ، چـوونە لای پـەیکەرەکـەو چۆکیـان داداو دەستیان کـرد بە نوێژکردنو داوایان لێ کرد سەرفـرازیان کـات بەم جـۆرە بە ئاشتیو خۆشی و هێمنو خۆشەویستیلەوە بۆ ماوەی شـەش ساڵ ژیان . بـەلام ڕۆژێکی زستان پـاش چاخـوادنەوەیـەکی گـەرم ، فازیکـا چووە دەرەوە بـۆ سەرپـەرشتی بـارکـردنی پاپۆڕێ ، تووشی لەرزبوو ، نەخۆشکەوت ، باشترین پزیشکی هاتەسەر ، بەلام نەخۆشییەکەی لێپیسکردو پاش چوار مانگ مرد . ئولینکا دووبارە بێوەژن کەوتەوە ، کاتێ مێـردەکەیـان ئەناشت بەوپەڕی سوگوارەوە ئەیووت ـ [ئێستا ڕووبکەمەکێ ، چۆن بتوانم بێتۆبژیم ، بۆ منت بەدڵ شکاویو ناشـادییەوە بەجێ هێشت ، بۆچی مـرۆڤی باش زوو ئـەچێتەوە بـارەگای خوا] .

جـلی ڕەشی لەبـەرکـرد . پـوزەوانـەی سپی تـەپلەو دەستکێشی لە دەست نەئەکرد . زۆر بە دەگمەن ماڵی بەجێ ئەهێشت ، تەنیا جارجار لەگەڵ چێشتکەرەکەیاندا ئەچـووە بازاڕ ، جگە لەوە مـەگەر بـۆ کڵێسە یـا خود بـۆسەر گـۆڕی مێردەکەی بچوایە .

لە ماڵیشەوە وەکو (زێوان) ئەژیا . پاش شەش مانگ جلە ڕەشـەکانی داکـەندو تـازێ بارییـەکەی شکـانـد . کـەس نەینەزانی چۆن ئەژیوچی لە ماڵەکەیدا ڕووئەدات ، ئەوەشی لە بارەیەوە ئەووترا لەسـەر ئەوە بـەندبـوو ، لەگەڵ بـەیتاڵە سـەربازەکـە دیبوویـان لە باخچـەکەدادانیشتبـوون ، کابـرا ڕۆژنامەی ئـەخوێنـدەوە ، چا یـان ئەخـواردەوە . جاریکیشي پێکەوە لە پۆستە دیبوویانن . گوایـە وتبووی ـ [سـەرپەشتی کەرێکی بەیتاڵی ڕاستەقینە لە شارەکـەماندا نـییـە ، بۆیـە نەخۆشی بڵاوە . تۆ زۆر جار ئەبیستی خەڵکی لە شیرەوە ، یان لە مانگاو ئەسپەوە نەخۆشی ئەگرن .

ئـەگـەر بـاش لێی بکـوڵێتـەوە پێـویستـە گـرنگی بـە تەندروستی ئاژەڵە ماڵییەکان بـدرێ تا تـەندروستی مـرۆڤ

سوکەر بکرێ] .

ئێستا لاسایی قسەکانی بەیتاڵەکە ئەکاتەوە . بیری لەو شتنە ئەکردەوە کە ئەو ئەیکردن . وادەرئەکەوێ نەتوانی تەنیا ـت ساڵ بەبێ پەیوەندی بژی . شادی‌یەکی نوێی لە ـڕیجی‌یەکەیدا بەدی ئەکرد . ئەگەر ئافرەتێکی‌تر ئەمەی ـڕایە ڕەخنەی لێ ئەگیرا ، بەڵام ئۆلینکا لێی ناگیرێ . چونکە ـڕاستی کلۆڵو بەدبەخت‌بوو کەسیان باسی گۆڕانی پەیوەندی ـوانیان بۆ خەڵك نەئەکرد . هەوڵیاندا بیشارنەوە ، بەڵام ـرنەکەوتن . ئۆلینکا نەیئەتوانی نهێنی بپارێزێ . کە ـیتاڵەکە میوانی ئەهات ، چای بۆ تێ‌ئەکردن‌و خواردنی بۆ ـهێنان‌و باسی چاوە قوڵەی ئاژەڵ‌و نەخۆشی توتی‌و قەسابخانەکانی بۆ ئەکردن . کابرا زۆری پێ ناخۆش‌بوو ، کاتێ کە میوانەکانی ئەڕۆیشتن شانی ئەگرت‌و بە پەستی‌یەوە ـڕای ئەوەشاندو ئەیووت :

- [چەند جار پێم ووتی خۆت لەشتێ هەڵ مەقورتێنە کاری تۆ نەبێ ، باسی شتێ مەکە کە تێی ناگەی ، بەڕاستی شتێکی ناشیرینە] .

ئەمیش بە سەرسوڕماوی‌یەوە سەیری ئەکردو ئەیووت [بەڵام ئەی باسی چی بکەم] . فرمێسکی لە چاو ئەباری ، تکای لێ ئەکرد زویر نەبێ ، ئاشت ئەبوونەوە . بەڵام ئەم بەختەوەری‌یە زۆری نەکێشا ، کابرای بەیتاڵ ڕۆیشت‌و نەگەڕایەوە . چوو بۆ شوێنێکی تازە . دوو بارە ئۆلینکا بە تەنیا مایەوە .

لەمێژە باوکی مردووەو کورسی‌یەکەی لە ژووری نەختینەدا تۆزگرتوێتی‌و پێچکەیەکی شکاوە . ئۆلینکا تا ئەهات لاواز ئەبوو ، دیدەکانی نە ئەبریسکا نەوەو ڕێبوارەکان وەکو لەوەوپێش سەیریان ئەکردو زەردەخەنەیان بۆ نەئەگرت ، بێگومان ساڵە خۆشەکانی ژیانی بەسەرچوو ، قۆناغێکی تری ژیانی دەستی پێ‌کرد ، قۆناغی ناموێی . بیرکردنەوەی نەمابوو . ئێواران لە ناو جۆلانەکەدا لە ناو باخچەکەدا دائەنیشت‌و گوێی لە شانۆکانی (تیڤۆلی) ئەو ڕۆکێتانە ئەگرت کە دەرئەچوون بۆ ئاسمان . بەڵام ئەمانە هیچ مانایەکیان لا نەئەبەخشی‌و نەیان ئەجولان . لە باخچەکەدا ئەبلەق بووبوو بێ ئەوەی بزانێ لەچی ئەڕوانێ .

شەوانەش خەوی بە باخچە بەتاڵەکەوە ئەدی . نانی ئەخوارد بەڵام بە شێوەیەکی خونەویستانە . هەمووشی خراپ‌تر ئەوەبوو نەیئەتوانی بیر لەو شتانە بکاتەوە کە لە دەوروبەری خۆی ئەیدین . نەیئەزانی باسی چی‌بکات . چەند شتێکی سامناکە کە نەتوانی بیر بکەیتەوەو بۆنموونە شووشەیەك یان باران‌بارین یان جووتیاریك کە گالیسکەیەك لێ ئەخوڕێ بەڵام نەی ئەزانی شووشە بە کەڵکی چی‌دێ ، باران بۆ ئەباری جوتیار بۆگالیسکە لێ ئەخوڕێ ، بەڵام کاتێ کە «کوکین» و «ڤانیکا» مابوون یان کە بەیتاڵەکە لەوێ‌بوو بیری لە هەموو شتێ ئەکردەوەو هەژدە هەژدە قسەی دەکرد . بەڵام ئێستا دڵی نامۆو سەری وەك باخچەکەی چۆڵە . تامی هەموو شتێکی لە دەما تاڵ‌بووە .

زۆری نەبرد شارەکە بە هەمولادا فراوان‌بوو . ڕێگای قەرەجان ئێستا بۆتە شەقامێکی ڕێك‌و پێك «تیڤۆلی»و خانوەکانی دەوروبەریشی نەماون . ئای کە کات بە خێرایی ڕائەبووڕێ‌و بەسەرئەچێ . ئێستا خانووەکەیان داڕووخاوەو بنمیچەکەی لە زۆر لاوە داخزاوەو باخچەکەی بۆتە گیاکەڵە . «ئۆلینکا»ش چۆتە تەمەنەوەو ئێستا سەرەژنە . هاوینان لە جۆلانەکەدا دائەنیشت‌و هەستی بە نامۆییەکی تاڵ‌و قورسی ئەکرد ، زستانانیش لە پەنجەرەکەدا دائەنیشت‌و لە بەفر بارین وورد ئەبۆوە ، سەرەتای بەهارانیش کە شنەبا دەنگی زەنگی کڵێسەی پێ ئەگەیاند ، یادگارەکانی ئەژیانەوەو دڵی ئەگوشرا ، بزەیەك سەرلێوەکانی ئەگەشانەوەو فرمێسك ئەزایە چاوەکانی . ئەمەش ماوەیەکی کەمی نەخایاندو دووبارە ئەکەوتەوە ناو نامۆیی‌یەکەیەوە . پشیلە ڕەشەکەی ئەهاتە لایەوەو خۆی تێ هەڵئەسوو . بەنەرمی‌یەوە خنکەی ئەهات . بەڵام ئەمە نەی ئەبزواند ، چونکە پێویستی بەمە نەبوو ، پێویستی بە هەست وسۆزێك‌بوو هەموو بوونی بگرێتەوە ، هەستی بیرکردنەوەی بداتێ‌و سەری چۆڵی پڕکاتەوەو هیوایەکی بداتێ لە ژیاناو خوێنە ساردەکەی گەرم بکاتەوە . پشیلەکەی لە باوەشدا ئەلاواندەوەو ئەیوت :ـ

«ختە .. خت پیاما مەنوسێ» . ڕۆژان‌و مانگان‌و ساڵان

تێ‌پەڕین‌و بیرۆکەی مێشکی ڕۆشن نەکردەوە . ئێوارەیەکی گەرمی مانگی شەش لەو کاتەدا ئاژەڵ بەرەو ماڵ دەبێتەوە ، کۆزەکان پڕ ئەبوون لە تەپ‌و تۆز ، یەکێك لە پڕ لەدەرگای دا . «ئۆلێنکا» خۆی چوو بیکاتەوە . سەری سووڕماو زمانی شکا ، سیمرینی بەیتاڵ لە بەر دەرگاکەدا ڕاوەستابوو ، جلێکی شاری‌یانەی لەبەردابوو ، ڕەنگی خۆڵەمێشی لێ‌نیشتبوو ، ئۆلێنکا ژیانی ڕۆژانی ڕابووردووی هاتەوە بەرچاو . خۆی بۆ نەگیراو دایە پڕمەی گریان . سەری کردە سەر سنگی‌و نەیان زانی چۆن هاتنە ژوورەوەو چۆن کەوتنە چاخواردنەوە . بە شادیەوە منجە منجێکی‌کرد «ئازیزەکەم ڤلادیمێر چی تۆی هێناو چۆن هاتیتەوە» . ئەویش ووتی :- [لە سەربازی کارکەنار کراوم‌و هاتومەتە ئەم شارە بۆخۆم کار بکەم‌و کوڕەکەشم بخەمە بەر خوێندنی باڵا . پێم نەووتی ؟ ! لەمێژە ژنەکەم ئاشت کردۆتەوە ؟ !] .

پرسی - [لەکوێ‌یە ؟ !]
وەڵامی دایەوە :
- [لەگەڵ کوڕەکەمدا لە ئوتێلە ، هاتو وم خانویەکیان بۆ بەکرێ بگرم] .

ئۆلینکا ووتی - [شتی چاکە ڤلادیمێر ، ماڵەکەی من پێشکەشتان بێ ، پێویست ناکات بە دوای خانوودا بگەڕێ‌ی] ، بە دەم‌و لیوێکی لەرزۆکەوە دەستی کردەوە بە گریانەوە ووتی [ئێوە لێرەدا بژین ، منیش لە کوچەیەکی‌دا جێم ئەبێتەوە ، پارەشتان لێ ناسەنم ، ئای خوایە ، بەڕاستی من دڵشادم] .

بۆ سبەینێ کەوتنە بۆیەکردنەوەی بنمیچ‌و سپی‌کردنەوەی دیوارەکان ئۆلینکاش بەزەردەخەنەکەی جارانی‌یەوە ، کەوتە ئەمسەرو ئەوسەر کردن‌و سەرکاری کردنیان ، ئۆلینکا وەکو لە خەوێکی دووروودرێژ بێداربووبێتەوە ، زیت بووەوە ، ژیایەوە . ژنی بەیتاڵەکە سەرەژن‌و لاوازو قژی بڕبوو ، (ساشا)ی کوڕی لە گەڵدابوو تەمەنی دەساڵان‌بوو ، بزێوو چاوەکانی شین‌و گەش‌بوون . هەر کە پشیلەکەی‌دی بەدوای‌دا ڕایکردە ناو باخچەکەوە . زۆری نەبرد خۆشی‌و شادی‌و چالاکی هەموو لایەکی گرتەوە ، پێکەنینەکەی شادی ئەپەخشان . لە ئۆلێنکای پرسی . [پوری ئەمە پشیلەی تۆیە ، دایکم زۆر لە مشك ئەترسێ ، ئەگەر بەچکەی‌بوو ، بەچکەیەکم بدەرێ] . ئۆلێنکا کەوتە دواندنی م پاشان چای دایە . لە پڕ دڵی گەرم بووەوە بە خۆشی‌یەوە کرژئەبوو . هەروەکو ، (ساشا) منداڵی خۆی‌بێ .

ئێوارەش ، کە منداڵەکە دانیشیت بۆ نوسینەوەی وانەکانی بە دڵ نەرمی‌و بەزە یی‌یەوە لێ‌ی ورد بووەوە ، بەدەنگی نزم پێ‌ی ووت :
- [ئازیز ، شۆخ‌و شەنگەکەم ، بچکولەکەم ، چەندە زیرەك‌و کاڵێ‌ی] .
لەبەر خۆیەوە دەستی‌کرد بە خوێندنەوەی کتێبەکەی [دوورگە ، پارچە زەوی‌یەکە هەموولایەکی بە ئاو گیرابێ .
ئۆلینکا وەکو بیرۆکەیەکی بۆ هاتبێ ووتی [دورگە پارچە زەوی‌یەکە ...] بەڵێ ئەمە یەکەم بیرکردنەوەی‌بوو پاش ساڵانێکی بێ دەنگی‌و سستی مێشك .

ئێستا توانای بیرکردنەوەی هەیە ، کاتی نانی ئێوارە ، کەوتە ئاخاوتن لە گەڵ باوانی (ساشا)دا ، ئەیووت کە خوێندنی قوتابخانەی باڵا گرانە بۆ منداڵان . ؟ بەڵام هەرچۆنێ‌بێ خوێندنی کلاسیکی لە خوێندنی زانستیانە باشترە ، چونکە خوێندنی کلاسیکی هەموو دەرگایەکت بۆ ئەخاتە سەرپشت بەڵام خوێندنی زانستیانە وات لێ ئەکات یان ئەبیتە (پزیشك) یان (ئەندازیار) .

ساشا ، ئەچوو بۆ قوتابخانەی باڵا ، دایکی چوو بۆ خارکۆف ، بۆ دیدەنی خوشکەکەی ! وابە زوویی نایەتەوە . هەموو ڕۆژێك باوکی شار بەجێ ئەهێڵێ بۆ پشکنینی مۆڵگەکان ، زۆر جار دو سێ ڕۆژیش ئەمایەوە . ئۆلینکا وای هەستکرد ساشایان پشت گوێ خستووەو‌بەتەنگیی‌یەوەنین ، برسی ئەبوو ، بردی یە لای خۆی لە ژورێکی بچوك‌دا داینا .
ئەوە شەش مانگە ساشا لای ئەمە . هەمووبە یانی‌یەك ئەچێتە ژوورە بچکۆلەکەیەوە ، ئەوخەوتووە ، دەستی خستۆتە ژێر ڕوو مەتی‌یەوە ، لەسەرخۆ هەناسە ئەدات ، بە داخەوەیە کە ئەبێ هەڵی بستێنێ ، بە خەفەتباری‌یەوە ئەڵێ :-

- [ساشا ، هەستە دڵەکەم ، کاتی قوتابخانە هاتووە ]

هەڵ ئەستێ ، خۆی پۆشتە ئەکاتەوە ، نوێژ ئەکا ، ـ ئەنیشێ بەرچایی بکاتەوە ، سێ پەرداخ چا ئەخواتەوە ، دوو ـرچەی زل نانو کەرتێ کەرەی فەرەنسی ئەخوات ، هێشتا ـحەواڵو وە پاشان نیشانەی خاچ دروست ئەکا .

ئۆلینکا هەر وەکو پاش نامۆیی‌یەکی درێژ دیبینێ ، لێی ـ ئەبێتەوەو ئەلێ [ئینجیلت لەبەرنەکردووە ساشینکا ، بەمە ـو دڵ ئەبم ، پێویستە باش کۆشش بکەیت ، باش گوێ بدە بە ـمۆستاکانت ، ئازیزەکەم باش بخوێنە] .

ساشا ئەلێ [تکایە وازم لێبهێنە]. ئەمە ئەلێو ـەپیلیکانەکاندا ئەڕواتە خوارەوە بۆ قوتابخانە، تەپلە یەکی گەورەی لەسەردایە. کتێبەکانی لە جانتاکەی کولیایەتی، ـۆلینکا بەبێ ورتە دوای ئەکەوێ. بانگی ئەکات [ساشینکا]. ـۆڕ ئەداتەوە. ئەمیش دەنکێ خورمایان چنگێ‌مێوژ ئەخاتە ـمستی‌یەوە کە ئەگەنە سنووری قوتابخانە ، ئەو شەرم ـاینەگرێ، کە ئەم کەڵە ژنەی لە گەلابێ ، خۆشحاڵ‌نی‌یە . ـەیری دەورو پشتی خۆی ئەکاو ئەلێ - [ئیترخۆم ئەتوانم‌بە تەنیا بڕۆم، باشتروایە تۆ بگەڕێیتەوە].

ڕا ئەوەستێو لە دواوەڵێی ورد ئەبێتەوە تاکو لە ، ـرچاو نامێنێو ئەچێتە ژوورەوە. نە باوکی ونە دایکی هێندەی ئەم خۆشیان نەئەویست وهیچ پەیوەندی‌یەکی لەوەوپێشی هێندە قوڵو گەرم نەبوو.

هەرگیز لەوەو پێش گیانی هێندە گیرۆدەو شاد نەبووە، هێندە خۆشی لە پەیوەندی‌یەکانی تر نەبینیوە، ئێستا هەستی دایکێتی تیا ژیاوەتەوە بەرابەر ئەو منداڵە بچکۆلەیەی هی خۆی‌نی‌یە.

قنچکەکانی دەم و چاوو تەپلە زلەکەشی خۆش ئەوێ. ژیانی خۆی بۆچی تەرخان‌کر دووە. ئایا ئەم تەرخان‌کردنە شادی ئەکات، یان چاو بە فرمێسکی ئەکات، بۆچی کێ ئەزانێ، بۆچێ؟!

کە ساشای ئەدی ئەچوو بۆ قووتابخانە، لەسەرخۆ ئەگەڕایە ماڵەوە،هێمن‌و قایل، خۆشەویستی لێ ئەتکا. لەو شەش مانگەدا، ڕەنگی لاوێتی لێ نیشتەوە، شادی لە دەمو چاوی‌یا ئەدرەوشایەوە، کە خەڵکی ئەیان دی‌و تێنوارینیان سەر یەك

ئەکەوت ئەیان ووت - [بەیانیت] باش ئۆلگا سیمینوڤنای ئازیز. ئازیز چۆنی؟ باشی؟] بە دەم شتکڕینەوە ئەیووت خوێندنی قوتابخانەی باڵا زۆر قورسە بۆ منالاّن . سەیرکە دوێنێ وانەی یەکەم، لەبەرکردنی ئینجیل یان هەبووە. بەرچڤەی لا تینی وچەند پرسیارێکیان داونەتێ بۆ ئەرکی ماڵەوە . بە ڕاستی ئەمە زۆرە بۆ منالێکی بچوك] .

پاشان باسی مامۆستاو وانەو کتێبەکانی ئەکرد، بەو شێوەیەی باسی ئەکردن کە ساشا باسیان ئەکات .

کاژێری سێ نانی نیوەڕۆ ئەخۆن ، ئێوارەش پێکەوە خەریکی وانەکانی ئەبن . کە ئەیخستە جێگەوە ، ماوەیەکی زۆر لەسەر سەری نوێژی ئەکردو نیشانەی خاچی دروست ئەکرد .

. پاشان ئەچووە جێی خۆی‌و بیری لە داهاتوو ئەکردەوە . بیری لە داهاتوویەکی دوورو نادیار ئەکردەوە کاتێ کە ساشا خوێندن تەواو ئەکاو ئەبێتە دکتۆر یان ئەندازیار ، خانوویەکی گەورەی ئەبێ ، گالیسکەو ئەسپی ئەبێ و ژن ئەهێنێو ئەبێتە باوك . خەوی لێ ئەکەوێ ، لە خەویش‌دا هەمان شت ئەبینێتەوە ، فرمێسکەکان لە چاو لێك نراوەکانی یەوە بەسەر ڕوومەتیا خلۆرئەبنەوە . پشیلە ڕەشەکەشی لە تەنیشتی‌یەوە پاڵ کەوتووە ئەپرمێنێ . (پرپر) . لەپڕ بە توندی لە دەرگا ئەدرێ . ئۆلینکا بێدا رئەبێتەوە . هەناسەی سوار ئەبێ ، ئەترسێ ، دڵە کوتێی پێ‌ئەکەوێ پاش نیو خولەك بە توندی لە دەرگا ئەدرێتەوە .

لە دڵی خۆی‌دا ئەلێ [ ئەمە بروسکەیەکە لە خارکوف ەوە] هەموو گیانی ئەلەرزێ [ئۆ خوایە ، دایکی ساشا ، لە خارکۆفە وە ناردوویەتی]

تۆقیوە . دەست‌و سەرو قاچی سارد ئەبنەوە ، واهەست ئەکات ناشادترین ئافرەتە لە هەموو جیهان‌دا پاشی خولەکێك دەنگێ دێت ، دەنگی کابرای بە یتالە لە (یانە) گەڕاوەتەوە . لە دڵی خۆی‌دا ئەلێ [باشە ، سوپاس بۆ خوا] .

وردە وردە دڵی دێتەوە سەر خۆی‌و هێمن ئەبێتەوە . ئەگەڕێتەوە ناو جێگاکەی ، بیر لە ساشا ئەکاتەوە ، ئەویش ئێستا لە ژووری ئەو دیو خەوتووە ، شتێ لەخەوەکەی‌دا ئەقریشکێنێو ئەلێ :ـ

- [باشە ، ڕووت گرژمەکە ئەت‌دەمێ ، شەڕی ناوێ] .

# روخسارو ناڤەرۆك د شانۆوا جەهدێدا

د . سعدی یونس

وەرگێرانا

عبداللە محمد عبداللە

زەحمەتە کو ئەم بکارین روخسارو ناڤەرۆکێ د کار
هونەریدا ژێك ڤەکەین ، چونکی براستی ئەڤ هەردو نە هێز
و نابیتن ژێکجودابن . وەکی یاخۆیایە روخسار دەربرینە ژ
ناڤەرۆکەکا دیارکری ، ناڤەرۆکژی د ڤێتن روخسارەکێ تایبە
هەبتن ..

بەلێ ژبو ساناهیو دیارکرنا ڤی بابەتی ئەم دێ لسە
ئاخڤینو من دڤێت ئەز ژێکجوداکەم دا بکارم بدروستی لسە
باخڤم ئەم تەڤ دابکارین بگەهینە رهۆ ریشێن ڤێ گرفتاریێ
ژ بەر چ ئەڤ گرفتاری‌یە ؟ چونکی براستی دۆزە
هوورەو هندەکا بگرێیە ... دۆزەکا خەتەرەو بوونا شانۆ
جەهدێ دیار دکەت . گەرماتیا وێ پەیوەندیێ د ناڤبە
روخساری ئان بینینا دەرهینانێ ( الرؤية الاخراجية )
لناڤبەرا ناڤەرۆکێ ئان وێ تێکستا نڤێسی . ئەڤەژی دۆزەک
دڤێت هەمی عونسرێت کارکرنا شانۆیی خولێکبدەن د ریکا وێ
بەهرا گران ، دا دویماهیێ بشێت خەلکێ بەرفرەهێ جەهدی
باوەری بکارێ وان بهێت ئەوا ژبو سەخمراتیا وان ئەڤ شانۆیە
هاتیە دورستکرن . بەری هەمی تشتا ئارمانجا شانۆوا جەهدی
ئەوە کو بزاڤێن خوە پێشکەشی خەلکی بکەت لهەر درا هەی
لجەهدێ بت ، لکارگێ ، نەخوشخانێ ئان لچەیخانێ ئانژی
لهەچ درا بکارت شانۆ دەورێ خوەیی هەڤپشکی‌یی پێشرە
ببینیت ... بڤێ ئێکێ دکارت ناما خوەیا پیروزا بەرکەتی
بگەهینیتە ئارمانج ئەوا کو ژبو هندێ هاتیە بەرهەڤکرن . بێی ڤێ
ئێکگرتنا موکوم دگەل خەلکێ شانۆوا جەهدێ تەڤ بهایی وێ
یی رەسەن دێ ژ دەست چیتو هندابت ئو دێ بتە گوتنەک
پویچو بەتال . ژڤێرە نەمازە ژڤێ خالێ بتنێ دبیت پەیوەندیەک
گەرم هەبت لناڤبەرا بینینا دەرهینانێو هەڤال بەندیا وێ دگەل
تێکستێ .

کارێ شانۆگەرێی تێتە پێشکەشکرن بو خەلکەکێ گەلەک
بۆش ، ڤێجا لسەر ڤێ ئێکی دبیت دەرهێنەرو نڤێسەر پێکڤە
هزرو بیرێن خوە بکەن دا بکارن بنواشا ئەڤی کاری بتەرزەکێ
رندو سپەهی بینە دەست .

د شانۆوا جەهدێدا ئەو خەلکێ دیارکری نینە کو بکەڤنە
تەناهیو تەسلێی د هولێدا ، کو تەڤ شەرتو شوینێن هونەری

— بەیدا ببن . بەلێ ئەوا هەی ئەوە ئەڤ هونەرمەندەنە هەر
[illegible] یێ د گەریانەکا بەردەوامدا ژ بو وێ ئێکێ دابشێن روژ بو
[illegible]ێ خەلکەکێ نوی خرڤەکەن لدور دوزا شانوێ . پێکهاتنا
[illegible]وا جەهدێ مینا خلێفکەکا مێش هنگڤینێیە ئەڤ دگەلێك د
[illegible] بیی سەرگێریا ژ خوە چێکەن ژ بو دورست کرن و ابداعا
[illegible]یت شانوگەریێ د جهێت وەلێدا کو شانوگەری لێنەهێتە
[illegible]کرن . د بیت جهەکێ وەتوڤبت کو بئێکجاری نە بلاجکتورنە
[illegible] شانوێ ئو هولژی نەبت ئو دگەل هەچ پێتڤیەکا دییا
[illegible]ویی ، ڤێجا لڤێرە ئەوە لسەر دەرهێنەری بزانیت دێ چاوە
[illegible]وگەریا خوە دگەل ڤی بارو زروڤ گونجینیت .

لڤێرە ئەو پرسیار جارەکادی تێتەڤە بەرچاڤ : ئەو چ هونە
ئەوێن دەرهێنەر دێ بکار ئینیت دا بکارت بگەهتە بنەجهەکا
تەیەتی ؟ لدویف زانین و گروڤێن من دڤێ ئێکێدا ئەز یێ لوێ
باوەریێ دەرهێنەرێ شانوێا جەهدێ پێتڤیا ب ( هور بنێریتە
کارێ خوەو بزانت دێ چ هلبژێریت و خودان بەهرە بت ) .

کێمکرن ژ تشتێن پێشکەشکرنێ ژ ئەکسواری و دیکوراو
روناهیێ تشتەکێ گەلەك پێتڤیە دا کو ئەو تیپ گەلەك ئەوە سیت
د گەریانا خوەدا ، دا بارێ وێ یێ گران نەبت ، ژبەر کو بکارت
هەرگاڤ پەیوەندیێ بهەمی تەخێن مللەتی بکەت . بەلێ دڤێت
دڤێ پاشدە ستێیدا گەلەك باش ئاگەهدار بین ... چونکی مە
گوت ( هور بوون و هلبژارتن و بەهرە ) چونکی کارێ
دەرهێنەریێ نە کارەکێ نەبەرهەڤکریەو بلەزە . دگەل
پاشدەست خستنا تشتێن ئەم بکار دئینین دڤێت کارێ ئیبداعیێ
هونەری بوان تشتا بخوە بنەجهـ کەین . لڤێرە یاسا ساناهیێ
سەر هلددەت .. ئەڤ یاسایە ئەوا دمینیت و د بتە یاسایەکا
گرنگو بەرکەتی د تەڤ کارێن هونەری . ئالاڤ د شانوێا
جەهدێدا چو دەورێ وەلێ نابینیت ژبل دەورەکێ بچووك
دکارێ دورستکرنا هونەری . باشە پاکی دەورێ سەرەکی دڤێ
شانوێدا دبینیت ؟ پرسیارەکا گەلەك بەرکەتی یە بەرسڤا ویژی
دبتە ئستوینەکا موکوم د شانوێا جەهدێدا .. ئەوێ دەورێ
سەرەکی دبینیت دڤێ شانوێدا ( مروڤە ) ئانکو ئەکتەر ، ئو
ئەڤ سێ یێن بەرکەتی ( نڤیسەرو دەرهێنەرو ئەکتەر ) دبنە
بەرێ شێنستەی دڤێ شانوێا مەدا ئو بینەر دبتە ئاڤاهیێ مای د
سەردا .
دەرهێنەر دبتە پرەك لناڤبەرا نڤیسەری ژ ئالەکی و لناڤبەرا
ئەکتەری ژ ئالەکێ دیڤە ئو هەر ئەوە ئەکتەری دلڤلڤینیت لدویف
پێتڤییت ناڤەروکێ . لڤێرە خر چاڤ لشیانا ئەکتەری تێنە زلکرن
ئانکو بێژین هێزا مروڤی د دەربرینا ئێش و گرفتاریێن خەلکی و
هیڤی و داخازێن وان لپاشە روژێ . یا لسەر ئەکتەرێ شانوێا
جەهدێ ئەوە کوپیی زاناو سەرکەفتی بت دکارێ خوەدا بهەمی
لق و تابێن خوەڤە چ ژ دەربرینا ئاخفتنا خوە ئان ژ کریارا پێ
رادبت ( ومایم و بانتومایم ) . ئو بگەهتە هندێ کو بزانیت
بسترت و بلەیزیت و ئەکروپاتیکێژی بزانت دا دەرهێنەر بکارات
تەڤ ئاوازێن شانوگەریا دیارکری بژەنت . لگاڤەکا وەلێدا ئەڤ
ئالاڤ دێ ژبەر شیان و کریارا ئەکتەری کەڤن ، لڤێرە ( مروف -
ئەکتەر ) دێ بتە ئارمانج و هیڤی هەر مروڤەژی دێیتە بینەر .
ئەم لڤێرێ یێ لبەرامبەری ئەزمانەکێ هونەری دبت ئەو
ئەزمانژی یێ نوی بت ، دبت هەر ئەو بخوە ببتە دبستانەکا
شانوگەریا بەرکەتی .

بێهێنڤەدانەکێ بدەین و دا بکارن چارە سەرا خالا دەستپێکرنێ
د شانوێا جەهدێدا بکەین ئانکو تێکستا شانوێی . تێکست دڤی
حالەتیدا دبت ببتە کارەکێ هەڤپشکی ئانکو ئەڤ تێکستە بهێنە
نڤیسین ژ لایێ هونەرمەندێن شانوێ بخوە .
بەلێ ئەڤ کارە هەتا نهو ل ولاتێ مەدا سەر هەلنەدایە برەنگەکێ
فرەهو ئاشکرا ئەگەر هەبتژی حالەتەکێ گەلەك کێمە ، بەلێ
ئەگەر بهێتە تویژاندن و زەبتەکا باش هەبت ئەڤ کارە دێ یێ
سەرکەفتی بت . بو نموونە دکارن بێژین هونەرمەندەك ژوان دێ
هزرو بیرەکێ پێشکەشکەت بکێر هندێ بهێت کو ببتە بنواشە ،
ئەو هزرو بیر دێ پێشڤە چت و گەنگەشە دێ لسەر هێتە کرن ژ
لایێ ئەڤ ئەنداماڤە هەر ئێك ژلایێ خوە دێ هزرەکێ لسەر
زێدەکەت ت وەلێتێت ئەو بنواشە دبتە بابەتەکێ گەلەك باش و
بەرکەتی بو شانوگەریێ . ئو دبت ئەڤ کارێ هەڤپشکی بگەلەك
تەرزابت .
یا پێتڤی ئەوە دشانوێا جەهدێدا ئەو کریارا پێ رادبت ژنیڤەکا
ئالوزی و گرفتاریێن خەلکی بت چونکی خەلك دەمێ دنێرنە
شانوگەریەکێ ئو بزانن کو وێ شانوگەریێ گوهـ نەدایە
گرفتاریێن وان و تەمسیلا وان ناکەت دێ بینین ئەو جمهور هند

گوهـ نادەتە وێ شانۆگەرێی چونکی د خلمەتا وایدانینە . ئەڤجا نڤیسەر حیسیلێن بنی ێن شانۆوا جەهدێ د دانیت دڤێت گەلەکێ شەهرزابت چونکی ئەڤ کارە نە کارەکێ وەسا بساناهیە بەلکی دڤێت یێ زاناو سەرکەفتی بت د نەپەنیێن هونەرێ خۆەدا . بو نموونە دبت بو داهینانێ د شانۆوا خوە جهەکێ ڤالاو تایبەتی بهێلت ئانکو گەنگەشە ئانژی تەمسیلکرن دگەل جمهوری دەورەکێ باش دنڤێسینێدا ببینن . ئێبتکار عونسورەکێ تازەیەو دەورەکێ گەلەك دبینیت ژ بو گرێدانا پەیوەندیەکا موکوم دگەل خەلکیو پشکدا ریا وانا هۆشمەندانە دکارێ هونەریدا . دگەل هندێرا پێتڤی یە لسەر نڤیسەری دراسا درامایێ بکەت ئانکو نڤیسینا شانۆیێ بدورستی تێبگەهت ژ رهو ریشاڤە . چونکی گەلەك جارا نڤیسەر دکەڤتە دراڤەکێ وەسا روی بروی جمهوری د دەمێ تەمسیلکرنێ ئەو خەلك پێکڤە دێ دەستێن خوە لێکدەن بێ کو تێکەهشتنەکا وەسا بدورستی دوێ مەسەلێ گەهشتبن برەنگەکێ باشو زیرەکانە . دراما راستو رەسەن دمینیت تشتەکێ گەلەك پێتڤی د شانۆوا جەهدێدا نەمازە ئەم دچاڤ پێکەفتنێن خوەدا روی بروینە دگەل جمهوری ، ئەڤجا پێتڤیە ئەم گەلەك چاڤێ خوە بدەینە هندێو بکارین سەرکەفتی بین د پێشڤە چونا گیولێ (ذوق) شانۆییو ئو دتشتێن هویرێن هونەری کو بگونجیت دگەل جڤاتا مەیا نوی .

دگەل ئەڤا رون کری دێ بومە خۆیابت پەیوەندیا موکوم لناڤبەرا روخساریو ناڤەروکێ د شانۆوا جەهدێدا ، دبینین پێکئینانێن ڤێ شانۆوێ چوجارا داهینانا هونەری پشت گوهـ ناکەت بەلکی هەر گاڤ وێ داهینانێ بەر چاڤدکەتو بو پێشڤە بچت . چونکی چاڤ پێکەفتنا شانۆیی دگەل خەلکێ بەرفرەهـ کارەکێ نویە دولاتێ مەدا نەمازە ئەوێ دڤێت جمهورەکێ نوی خڕ ڤەکەت لدور شانۆوا مە ، ڤێجا ڤێ ئێکێژێ دڤێت مروڤ ڕیا خوە ببرت بچاڤەکێ زلو تێکەهشتی ژبو روناهیەکێ ژیانا مەیا روژانە ڕوێن کەتن بوان شەمالکێن چوجارا نەهێنە ڤەمراندن .

باهاتیە وەرگێران ژ کوڤارا ـ الاقلام — 6 — 1980
عدد خاص ـ المسرح العربي المعاصر
من تجربتي المسرحية
الشكل والمضمون في مسرح الشارع ـ د ـ سعدي يونس

# پەرەسەندنی شانۆ

●

دلاوەر قەرەداخی
ئەكادیمیای هونەرە جوانەكان

●

هەر لە سەرەتاو لەو كاتەوەی كە كۆرپەی مرۆڤایەتی ، لەنێو لانكەی ئەندیشەو خەونە سەوزەكانیدا ، گوێی بۆ لایە لایەی [كاركردن]و هێنانە ئاكامی پێداویستییەكانی ژیانی رائەدێرا ، هونەر وەك دیاردەیەكی زیندوو كاریگەری نێو بوونە كۆمەلایەتی یەكەی ، شان بە شانی بەری رەنجی كارەكەی رەنگی ئەدایەوە ...

ئینسان هەر لە كەوتنە رێی [كلاوانەیەوە] ، گەرەكی بووە زۆر زێدەتر بنوێنێ لەوەی كە هەبووە ، گەرەكی بووە هەنگاو بەرەو جۆرە گشت گیرییەك بهاوێژێ ، بەوەندەوە نەوەستاوە لەنێو ئەلقەی تاكیەتە گۆشەگیرەكەدا لینگ بدات ، بەلكو بەرەو گۆشە نیگای ئەو گشت گیرییە نواریوێتی كە هیواو خەونەكانی تیادا بینیوەتەوە ... ئەو گۆشە نیگایەی وەك جیهانێكی روونترو دادپەروەرانەتر خۆی لەبەر چاوانیدا نواندووە ، ئەم جیهانێكی پڕ مانابووە هەر بۆیەشە بەرووی نەمانو فەوتانیدا لەناو بوونە دیاری كراوەكەیدا ، هەڵشاخا ، لێرەوە دەوری هونەر لە هێنانە ئاكامی ئەو ئارەزووەدا وەك شتێكی جەوهەری لای ئەو ئینسانە سەرەتایە خۆی ئەنوێنێ ، هەروەك ئەوەی بە هۆی ئەوەوە ، جیهانەكەی دەورو پشتی بگرێتە خۆیو [ئەنا] سنوور دارەكە پەیوەستی بوونە كۆمەلایەتی یەكەی بكا ..

ئەو ساتەی كە بە ناخی مێژووە دێرینەكەی مرۆڤایەتی دا رۆ ئەچین ، ئەوا مێژووی هونەر وەك ئاوێنەیەكی بالا نومای

# لە ڕەوتی پەرەسەندنی مرۆڤایەتیدا

میژووی مرۆڤایەتی دەبینین‌و بە دیارکەوتنی هەر پەرەسەندنێکیش تیایدا ، پرۆسێسی دیالەکتیکی‌یانەی خۆی‌و کۆمەلەکەیە ، هێندەی هونەر کار لە کۆمەل ئەکاو بەناخی ناتەبایی‌و کێشەو ململانێکانیدا ، ڕۆ ئەچی ، هێندەش کۆمەڵ ، بە پێی قۆناغە مێژوویی‌و ڕژێمە کۆمەلایەتی‌یەکە ، هونەرە ڕەسەن‌و ڕاستەقینەکەی خۆی بەدی دێنێ‌و لە خزمەتی ئامانجە کۆمەلایەتی‌یەکانیدا بەکاری دێنێ .

لەو کاتەداو بەهۆی داهێنانە هونەری‌یەکانەوە ، پێداویستی‌یە جەمالی‌یەکانیش تێر ئەبن ، هەر لە ڕێگەی ئەو دەورە جەمالی‌یەشەوە گرنگی‌یەتی‌و کاریگەرێتی هونەرو کارە ئایدۆلۆجی‌و کۆمەلایەتی‌و پەروەردەیی‌یەکەی خۆی ئەسەپێنی . هەربۆیەشە لاپەڕەکانی مێژووی هونەری شانۆ ، لە قۆناغەکانی پەرەسەندن‌و بەرەو پێش چوونیدا ئەخشێنین ، یەکەندەردوو دان بەو ڕاستیانەدا ئەنێین‌و پەرەسەندنی ئەو هونەرە شان بەشانی پەرەسەندن‌و بەرەوپێش چوونی مرۆڤایەتی ، لایەنەکانی ڕۆشنبیری‌و کۆمەلایەتی‌و ڕامیاری ، دەبینین‌و پەیوەندی‌یەکی توندو تۆڵیش لە نێوانیاندا هەست پێ دەکرێت .

دیارە ئەمەش لەبەر ئەوەیە کە هونەر وەك شێوەیەك لە شێوەکانی [ڕەنگدانەوە]ی واقیع لە هۆشیاری مرۆڤدا بەشداری‌یەکی چالاك‌و زیندووی لە ڕەوتی گۆڕانکاری‌و پەرەسەندنەکانا کردووەو وەك خاوەن وەزیفەیەکی کۆمەلایەتی تەعبیری لە ڕووداوو کارەساتەکانی قۆناغەکەی کردووەو لە هەندێك سات‌و لای هەندێك هونەرمەند هەوڵی گۆڕین‌و پێش‌خستنی واقیعەکەی داوە . گەر لایەك لە مێژووی شانۆی گریك بدەینەوە ، دەبینین هونەری شانۆ بەسەر دوو بەش‌دا دابەش بووە :ـ ئەوانیش تەراژیدیاو کۆمیدیان ، بابەت‌و کەسەکانی تەراژیدیا بریتی بوون لە ژیانی خواوەندو پالەوان‌و خواپێداوەکان ، ئەمە لەو کاتەدا کە کۆمیدیا چارەسەری تەنگ‌و چەلەمە میللی‌یەکانی ئەکردو زۆربەی کەسەکانیشی لەناو جەرگەی بازاڕەوە وەرگرتبوو ... ، لێرەوە دەگەینە ئەوەی بلێین کە هونەری شانۆ لەو حەلەدا ڕەنگی کۆمەلگەیەکی دابەش بووی بەدوو چینی کۆمەلایەتی‌یەوە ئەوانیش چینی نەجیب‌زادەکان‌و چینی ڕەشە خەلکەکەی گەل بوون ، کە کرێکارو جوتیارو کۆیلەکانیان پێك هێنابوو ..

هەرکە سەدەکانی نێوەڕاست هات‌و دیانەتی مەسیحی ئەوروپای تەنی ، هونەری شانۆی یونانی‌و . ڕۆمانی‌و شارەکانیان بە هۆیەوە لە چاوان بزر بوون ، لە شوێنەکەیدا شانۆیەکی مەسیحی پابەند بە کنیسە دامەزرا ، بەلام سەدەی ڕاپەڕین تێ نەپەڕیبوو کە ئەوروپای بۆ ژیانەوەو شوێن پێ هەلگرتنی کەلەپووری یونانی‌و ڕۆمانی گەڕانەوەو شانۆی دینی لەسەدەی ڕاپەڕینی ئەوروپادا کۆچی کرد .

هەروەك ئەوەی لەتەك ئەمدا زۆر بیرو ڕاو باوەڕی پووچ زیندە بەچال بوون‌و باویان نەما ، ئاکامی ئەمە شك بە دیارکەوتنی ڕێبازی کلاسیك بوو لە فەرەنسەدا ، کە ئەو کاتە خۆی بە میرات گری ئەسینای کۆن دا ئەنا ..

لەژێر ساو سێبەری ئەو ڕێبازە کلاسیکی‌یەدا کە بنەچەی دروست بوونەکەی داستانە یونانی‌یە کۆنەکان بوو ، ئەدەبی شانۆیی بەسەر تراژیدیاو کۆمیدیادا دابەش بوو بوو ، دیارە لەمەشیاندا شانۆ نامەکان ڕەنگدانەوەی کۆمەلگە چینایەتی‌یەکە بوون ، واتە چینی نەجیب‌زادەکان‌و چینی ڕەش‌و ڕووتەکە ، ئەمەو بە دیارکەوتنی شتێکی دی ، ئەویش پەرەسەندنی تەراژیدیاو کۆمیدیا بوو بۆ شانۆی کەسان [مسرح الشخصیات] پاشان ڕاگوێزانی ململانێی نێو شانۆ نامەکان لە

دەرەوەی پاڵەوانەکەوە بۆ ناوەوەی ..

ململانێ ، لای کلاسیکییەکان لە نێوان کەسەکانی شانۆ نامەکانیاندا نەمایەوە ، بەڵکو ململانێکان بۆ ناوەوەی پاڵەوانەکە ڕاگوێزران ، هەروەك ململانێی نێوان : هۆش و عاتیفە یان ئەرك و خۆشەویستی .

نموونەی ئەمەش : شانۆنامەی [السید] ی کۆرنی یە ... یان ململانێی سۆزە دەروونی یە جیاوازەکان ، نموونەی ئەمەش شانۆنامەی [ئەندرۆماك]ە ململانێ کە لە ناوەوەی پاڵەوانە ئافرەتەکە [ئەندرۆماك] ، لە نێوان سۆزی دەقا بۆ مێردە شەهیدەکەی [هیکتۆرو] سۆزە [دایکایەتی] یەکەیدا ڕوو ئەدات .

ئەمەش لەو کاتەدا هەستی پێدەکرێت کە لەلایەن بکوژی مێردەکەیەوە هەڕەشەی کوشتنی کوڕەکەی دەکرێت ، گەر بێت و بەشوو پێکردنی ڕازی نەبێ ، بێگومان ئەم پەرەسەندنە [ڕەنگدانەوە]ی پەرەسەندنی گشتی ژیانەکە بووە .

هەروەك ئاشکرایە ، گرنگترین جیاکەرەوەکانی سەدەی ڕاپەڕین لە ئەوروپادا ، بەدیارکەوتن و قووت بوونەوەی تاك بوو لەبەردەم کۆمەڵدا ، مانای ئەمەش دەرکەوتنی کەسێتی مرۆڤایەتی و داگیرکردنی شوێنی سەرەکی بوو لە کۆمەڵگەکەدا ، دوا بە دوای ئەمە شتێکی ئاسایی بوو ئەگەر شانۆنامەکان بۆ شانۆنامەی کەسان ، یان بۆ شانۆنامەی مرۆڤە نموونەییەکان بگۆڕدرێن ، نموونەی ئەمەش هەموو ئەو کەسە نموونەییانەن کە ڕێبازی کلاسیکی خوڵقاندوونی و ناوەکانیانی کردوتە ناونیشانی شانۆنامەکان ... وەك (ئەندرۆماك) و (فیدرۆ) بێرینس و (السید) و (دۆن - جوان) و (ترتۆف) و ئەوانی کە .

دیسانەوە شتێکی ئاسایی بوو ئەگەر ململانێی شانۆ - نامەکان لە دەرەوەی کەسەکانەوە بۆ ناوەوەیان ڕابگوێزرێن ، ئاکامی گرنگی دان ، بە ئینسان و دەستنیشان کردنی بوعدو شیکردنەوەی بنەما دەروونی و ئەقلییەکانی و ئەو ململانێیانەی کە لە ناوەوەی ڕا ڕوویان ئەدا ، ئەدەبی کلاسیکی بە ئەدەبی مرۆڤایەتی ناوزەدکرا .

هەرکە سەدەی هەژدەمین هات و ئەو کاتەی کە هەوڵی زەمینە خۆشکردن بۆ شۆڕشی فەرەنسی ئەدرا ، چینێکی کۆمەڵایەتی نوێ خۆی لە کۆمەڵگەکەدا بینییەوە ، ئەو چینەش چینی نێوە ڕاست بوو کە بە چینی بۆرجوا ئەناسرا ، ئەمەش ئەو چینە بوو کە لە شارەوەو لە ئەنجامی پەرەسەندنی بەرهەم و هۆی بەرهەم هێنەوە پەیدا بووبوو ، ناوە دەرهێنراوەکەشی لە ووشەیەکی ئەڵەمانی [بورج] وەیە کە مانای شار دەگەیەنێ ، ئەم چینە لە خاوەن بیرو خاوەن پیشە سەربەستەکان و پیشەسازە بچکۆلەکان پێك هاتبوو . ئەمە لەو کاتەدا کە لادێکان تا ئەو کاتە دابەشی هەردوو چینی نەجیب و کۆیلە یان نیمچە کۆیلە بوو بوون .. بەبێ ئەوەی چینێکی نێوەڕاستیان لە نێوانا بێ .

لەم مەسەلەیەدا هیچ ڕێبازێکی ئەدەبی نوێ پێك نەهات جگە لەو گفت و گۆو ووت و ویژانەی ڕێبازی ڕۆمانتیکی نەبێ ، کە تا ئەو کاتە وەك ڕێبازێکی ئەدەبی کامل نەبووبوو ... سەدەی هەژدەهەم سەدەی فەلسەفەو وەعی یەکی کۆمەڵایەتی وابوو ، کە شیاوی ئەوەبوو بناغەی شۆڕشی گەورەی فەرەنسە لەسەر زەمینەی خۆش بکرێ ، ئەدیب و خاوەن بیرەکان بەر بەرەکانی کلاسیکییان لەوەدا ئەکرد کە ناشێ هونەری شانۆ تەنیا لە ، تەراژیدیایەکی دڵ تەزێن ، یان کۆمیدیایەکی بە قاقادا کۆبکرێتەوە ، چونکە ئەگەر وابێ ، ئەوا شانۆ ئاوێنەی ژیان نابێ و ئەرکەکەی لە نیشاندانی ژیاندا بە ناتەواوی بەجێ دەگەیەنێ ...

ئەو ئەدیب و خاوەن بیرانە ئەیان ووت ، ژیان وەك شێوە گشتییەکەی نە تەراژیدیایەکی دڵ تەزێنەو نە کۆمیدیایەکی بە قاقایشە ، بەڵکو لەیەك کاتدا گریان و پێکەنینیشی بەخۆیەوە گرتووە ، یان ژیان لە ڕەنگە گشتییەکەیدا نە ڕەشەو نە سپییە ، بەڵکو بەلای خۆڵەمیشیدا ئەنوارێ و تا ڕادەی دڵ تەزاندن نامان گرێنێ ، هەروەك تا ڕادەی قاقا لێدانیش نامان خەنێنێ ، ئا لەبەر ئەمە ئەو شانۆیییەی کە ناگاتە ڕادەی تەراژیدیای تەواوو کۆمیدیای تەواو ئەو شانۆییە کەوێنەی ژیان لە ڕەوتە گشتییەکەیدا دەکێشێ .

ئەم دیمەنە فەلسەفییە بە هاتنە کایەی جۆرێکی نوێ لە شانۆ نامە کۆتایی هات ، کە بە درامای فرمێسکاوی drama larmayant ناونرا ، درامای فرمێسکاوی ئەو دراماییە کە بە خەمێکی توندو بەهێزو دڵ تەزێن بینەر ناهەژێنێ ، بەڵکو

ـیکردنی خەمێکی وا کە جاوی پڕ لە ئاو بکا نەگاتە ڕادەی ـ نەیخرۆشێنی ... هەمان شت بۆ کۆمیدیاش ڕوویدا

هەر لەسەدەی هەژدەهەمدا ، بارە کۆمەلایەتی یەکـان ـ گۆڕان ملیان ئەنـا ، گەر ڕێبـازی کلاسیکی تـوانیبێتی ـنە کۆنەکان بگێڕێتەوەو لە بۆتەی هونەرێکی نایابدا دایان ـی و لە هەمان کاتدا تەراژیدیای بۆ نیشاندانی مەرگەساتی ـ فەرماندەو نەجیبزادەکان تەرخان کردبێ ، ئەوا سەدەی ـدەهەم پێڕەوکە بوون و گەشەی چینی بورجوای بەخۆوە ـی کە لەو کاتەدا چینی نێوەڕاست بـوووەو لە کۆتـایی ئەو ـەیەدا ئاگری شۆڕشی فەڕەنسی هەلگیرسـان و کۆتـایی بە ـ و فەرماندەو نەجیبزادەکان هێنا ..

لێرەوە ئەو چینە کۆمەلایەتی یە نوێیە کەوتە گەڕان بە ـوی شانۆیەکا تا تەنـگو چەلەمـەکانی ژیـانی خۆی تیـادا ـینێتـەوە بۆیـە فەیلەسـووفێکی شۆڕشگێڕێ وەك [دیدڕۆ] هەستی بەڕاستیی ئەو پەرەسەندنـە کۆمـەلایەتییـە کردو ـوای بەدی هێنانی درامایەکی ئەکرد کە بابەتو کەسـەکان تـەرجەمـەی حاڵی ئـەو چینە بێتو زادەی هـەستو نەستی ئەوان بێ ، بەمە جۆرێکی نوێ لە شانۆ نامە لەپاڵ تەڕاژیدیاو کۆمیدیادا بەدیار کەوت .. ئەویش درامای بۆرجوایە . درامای بورژوا ، تەنها لە جۆری هەلبژاردنی بابەتو کەسەکانەوە لە کلاسیکییەت جوێ نەبـووە ، بەڵکـو لە جۆری هـەلبژاردنی گـرێو تـەنـگو چـەلەمـەکـانیشـەوە لێی جـوێ بـووە .. کلاسیکییەت تەنیا بـەلای تەنـگو چەلەمـە مرۆڤـایەتییـە گـشتییەکانا ئەیشکاندەوە ... بە جۆرێك کە ئەدەبەکـەی بە ئەدەبی مرۆڤایەتی Humaniste ناونرا ، واتا ئەو ئـەدەبەی کـە چارەسەری تەراژیدیاکانی ئینسـان وەك ئینسان ئـەکا ، بـۆ نموونە ململانێی تەڕاژیدیاکان لە ناوەوەو لە ناخی ئینسانا ، لەنێـوان ڕەگـەزە پـەرشو بـلاوەکـانی سـروشتی خـودی مرۆڤایەتیدا ، وەك خۆشەویستیو ڕقو غیرەو ئەقلو ئارەزووو هەموو ئەو سۆزو هەستانەی کە کۆمەلی مرۆڤایەتی پێیانەوە هاوبەشە ڕوو ئەدات .

دیـارە سەرچـاوەی ئەو سـۆزو هەستـانە ، هـەروەك لەمەوبەر ووتمان لە سروشتی مرۆڤدا کۆ دەبیتـەوە ، پاش ئەوە ، فەیلەسـووفەکـانی سەدەی هـەژدەهەم بـە تایبـەتی [دیدرۆ] هاتن ئەوەیان ڕاگەیاند کە تەنگو چەلەمەکانی ئینسان هەمووی لە سروشتی ئینسانەوە وەك ئینسان هەلناقولێ .

... بەلکو گەر نەلێین هەمووی ، ئەوا هەندێکی لەشوێنی تاکەوە لە کۆمەلدا هەلدەقوولێ ، هەر وەها لەو پـەیوەنـدییە کۆمەلایەتی یانەشەوە کە تاکەکانی بەیەکدییەوە گرێداوە ، بە جۆرێك بنووسێ شانۆ نامەکان لە توانایاندا هەیە ، مـادەیەکی بەپێز لەشوێنی کەسە کۆمەلایەتییەکان یـان ئەو پیشـەیەی پێوەی خەریکن ، بۆ تەراژیدیاکانیان هەلبهێنجن .

ئەمە جگـە لە سروشتی ئـەو پەیـوەندییـانەی کـە بە یەکتری یەوەی بەستوون . بەم جۆرە [تاك] دەبێتە هەوێنی ئەو تەراژیدیایانە ، نەك تەنها لەبەر ئەوەی کە ئینسانـە ، بەلکـو لەبەر ئەوەی پزیشك یان پارێزەر یان بازرگان یان جوتیارە ، یان لەبەر ئەوەی باوك یان برایە .

بەم جۆرە ، دیدرۆ خۆی درامای بۆرژوای لەسـەر ئەو زەمینەیە بنیات ناو ناوی نا [کوری سروشتی] ...

پاش ئەوەی شۆڕشی گەورەی فەڕەنسا هەلگیرسا ، شانۆ وەك هێزێکی زیندوو کـاریگەرو خـاوەن مەسئـولیەتی یـەکی کۆمەلایەتی ، بەشـدارییەکی فـرەی لەبرەو پێـدانی وەعی شۆڕشگێریدا کرد ... جێی سەرسوڕمـانمان دەبێ ، کـاتێك تێبینی ئەوە دەکەین کە کۆمیدیا ئەو هونەرەبوو کـە بە بـرەو پێدانی بەشێکی زۆری ئەو هۆشمەندییە هەلساوە پاش ئـەو نەشئەو نۆماو پەرەسەندنە ، کۆمیدیا لە [کۆمیدیای کەسان]دا نەمایەوە ... هەروەك ئەوەی لای [مۆلێر] هەبوو ، بەلکو یـان بـەرەو کۆمێـدایای شیکـردنەوەی دەروونیو کـۆمـەلایـەتی هـەنگاوی نـا ، هەروەك ئـەوەی لای [ماریفـو] ، یـان بـووە کۆمیدیای گرێ [حبكة]و ڕووداوە شۆڕشگێرییەکان .

سێینەی بۆرما شیەی بەناوبانگ [سەرتاشی ئەشبیلیە]و [ژن هێنانی فیجارۆ]و [دایکی تاوانبار] باشترین نموونەی ئەو جۆرە کۆمیدیایانەیە .

ئەو سێینەیە ، پالەوانەکەی کوڕی گەلە ، زۆر کارو پیشە تـاقی دەکاتـەوە ، هەر لەسـەر تاشییـەوە بیگرە تـا دەگاتـە خزمەتکاری لە مالی خوا پێداوەکاندا ، لەگەل ئەوەشدا بـە شێوەیەکی باش گالتە بەو گـەورە پیاوانـە دەکاو جـەماوەری شانۆیان پێ دەهێنێتە پێکەنین .

تا کار دەگاتە ئەوەی ، شا لویسی شازدەهەم بۆ ماوەی چوار ڕۆژ نووسەرەکەی لە بەندیخانەی باستیلدا بەند بکا .

پاشان بەهۆی تووڕەیی گەلەوە بە ناچاری بەرەلای کرد . شۆڕشی گەورەی فەرەنسا هەموو ئەو ئاواتانەی نەهێنایە دی کە خەلکەکە خەونی پێوە دەدی ، هەرزو چینی بورژوا وەك ئەرستوکراتی هەلگەڕایەوە کە لە سایەی پارەو سامانێکی بەرهەم هاتوی بازرگانیو پیشەسازیەوە حوکمی دەکرد ، خاوەن بیران بۆ جارێکی دی خۆیان لە کۆمەلێکی سەرمایەداری وادا بینیەوە کە هیچ بنەمایەکی مرۆڤو پیرۆزی یەکانی مرۆڤایەتی ڕەچاو نەکردبوو . ڕێزی هونەرمەندو بەهرە هونەریو ئەدەبیە ـ کانی تیادا نەگیرا ... لێرەوە ئەدەبیەکان دابەشی دوو پۆل بوون ـ پۆلێکی ڕۆمانسی ڕاکردوی لە ژیانو گۆشەن کردووی ذاتیو .. پۆلێکی واقیعیی ڕەخنەگر لە ژیانو دەرخەری ناتەواوییە کۆمەلایەتیو ئەخلاقی یەکان . ڕۆمانسی یەکان ئەو شانۆنامانەیان ئەنووسی کە خرۆشاندنو چێژی جوانکاری تیا دەبینرا .. ئەمە لە کاتێکدا کە ڕێبازی واقیعی بە توانایەکی باوەڕ بەخۆ بووەوە چارەسەری تەنگو چەلەمەکانی کۆمەلگەکەی دەکرد بە تایبەتیش چینە میللی یەکانی ، بەمە شانۆنامەی جدی [المسرحية الجادة] لەدایك بو کە بابەتو کەسەکانی لە چینە میللی یەکان وەردەگرت ، کە تا چەند سەدەیەکیش تایبەت بوو بە هونەری کۆمیدیا ... کەواتە لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت : ئەگەر فەیلەسووفو ئەدیبەکانی سەدەی هەژدەهەم تۆوی ڕۆمانسی یەتی یان لە زەوی ئەدەبو هونەردا چاندبێ ، ئەوا هەر لەو کاتەدا تۆوی ڕیالیزمیشیان تیادا چاندووە ، ئەگەر لە سەدەی هەژدەهەم دا [جان جاك ڕۆسۆ]مان دیبێ کە چۆن ڕێی بۆ ڕێبازی ڕۆمانسی لە فەرەنسەدا خۆش ئەکرد ، ئەوا [ڤۆلتێر] یشمان دیوە کە چۆن لە هەمان سەدەدا ڕێی بۆ ڕێبازی ڕیالیزم خۆش ئەکرد .

پاش هەلگیرسانی شەڕی جیهانی یەکەم ، ڕووداوەکان کاریگەرانە کاریان لە ویژدانی سەردەمو ئەقلی سەردەم کردو جیهانی ئەدەبو هونەریان لەتەك خۆیانا هەژاند .

ئاکامی هەموو ئەوانەش بەدیار کەوتنو ڕەچاو بوونی دوو ڕووداوی کاریگەربوو ، کە هەریەکەیان تا ڕادەیەکی باش کاری لە جیهانەکەی ئەدەبو هونەری کرد ، ڕووداوی یەکەم لە جیهانی ڕۆژ ئاوادا سەری هەلدا ئەمەش لەوکاتەدا بوو کە پیاوانی ئەدەبو هونەرو بیرو بڕوایان بە ئەقلی هۆشمەندیو هێزو توانای ئەو بۆ سەرکردایەتی مرۆڤ لە بەدی هێنانی بەختیاریو ئاشتیدا نەما ، هەربۆیەکە ، کەوتنە گەڕان بە دووی سەرچاوەیەکی نوێدا ، تا لە ئاکامدا ئەوەیان بینی یەوە کە فرۆیدو قوتابخانەکەی بە ناوچەی [ناهۆشمەندی] یان بە ئەقلی مرۆڤدا دا ئەنا ... ئەو ناوچەیەش کانگەی هەموو شتە تاسێنراوەکانی دەروونی مرۆڤو ئارەزووە غەریزی یەکانی ئەوی تیادا حەشار دراوە ...

ئەمەش ئەو بنەچە فەلسەفیەبوو کە ڕێبازی سریالیەتی لەسەر پێك هات ، واتە ڕێبازی سەروو واقیع یان ئەو دیو واقیع ... پاشان چەند شانۆنامەیەك نووسران کە پال پێوەنەرو دافیعەکانی لا شعوری مرۆڤیان ئەدۆزییەوە .. نموونەی ئەو جۆرە شانۆنامانەش ، شانۆنامەی [خانوویەك لە شووشە]ی نووسەری سریالی فەرەنسی [جان کوکتو]یە ، تیایدا بەربەرەکانی دایکێك لە ژنهێنانی کورەکەیدا ، بۆ ئەو کیژەی خۆشی دەوێ ، بەدیار دەکەوێت شانۆنامەکە ئەوەمان بێ دەلێت ، کە هەلوێستی ئەو دایکە زۆر جار لە خۆشەویستی یەکی سیکسی یەوە بۆ کورەکەی دێت ، بەتایبەتیش دایکێکی بێبەش لەو خۆشەویستی یە لای مێردەکەی ، ڕووداوی دووەمیان : تەقینەوەی شۆڕشی سۆشیالیستی بوو لە جیهانی ڕۆژهەلاتدا ، واتە شۆڕشی ئۆکتوبەر لە ڕووسیادا .

**لێرەوە ڕێبازی ڕیالیزمی سۆشیالیست لە کارە هونەریو ئەدەبی یەکاندا لەدایك بوو ، ڕیالیزمێکی ڕووناك بینی ئەوتۆ ، کە باوەڕێکی زێدەی بە ئینسانو ئاواتو ئامانجەکانی هەیە ، تا وا لە ئینسان دێ باوەڕی بە خۆیو بە دوێنێو بە برای ئینسانی بێو هیچ دژایەتی یەك لە نێوان کاری جەستەییو ذهنی دا بەدی نەکاو هەولی بنیات نانی ژیانێکی نوێ بدات ، لە کلاوڕۆژنەی ئەم ڕیالیزمە ڕووناك بینەوە هەموو ئەدیبو نووسەکانی جیهانی سۆشیالیست سەیری کۆمەلو سروشتو گۆڕانکاری یەکیان دەکەن . ئەگەر شەڕی یەکەمی جیهان ، ڕووخانی بنەما ئەخلاقی یەکانی تاكو ئەدەبی سلوکی کەسیەتی تاکی بە دوادا هاتبێ ، پاشان ئارەزووی شیکردنەوە لە فرۆیدو ڕێبازە فەلسەفیەکەیدا بۆ تێڕوانینی ژیانو هونەرو ئەدەب خۆی نواندبێ ، ئەوا شەڕی دووەمی جیهان شەپۆلی بەگوڕترو فرەوانتری لە فرۆیدی یەتو سریالیەت بەخۆیەوە**

ـیبود .

ئـه‌مانـه‌ش ئه‌و شـه‌پۆلانـه‌ن كه ئێستـا به وجـودیه‌ت ـه‌ـاسـرێن . وجودیـه‌ت هه‌روه‌كـو له مانـاكه‌یـه‌وه دیـاره ، ـه‌رهێنراوی وشه‌ی وجوده ئه‌مه‌ش له سه‌ر ئه‌وه‌ی كه وجـود Existence به‌ربه‌ره‌كانی ماهیه‌ت ده‌كات .

ئه‌وه‌ش به ئیعتیباره‌كه‌ی كه فه‌لسـه‌فه‌ی كـلاسیكی له ـه‌مانی [ئه‌فلاطون]ه‌وه ، وا سه‌یر ده‌كات كـه هه‌مـوو شتێك ـه‌هیه‌تێكی هـه‌یه . واتـه وێنه‌یـه‌كی میسالی رووت كـه پێش ـوونه‌كه‌ی ده‌كه‌وێ ، ئا به‌و شێوه‌یه هه‌موو شته‌كان له‌سـه‌ر وێنه‌ی ماهیه‌ته‌كه‌یان دروست ده‌بن ، به‌و مانایه‌ی كه ماهیه‌ت پێش بوون یان وجود ده‌كه‌وێ . بـۆ نموونـه ئینسان له‌سـه‌ر وێنه‌ی ماهیه‌ته پێشینه‌كه‌ی دروست ده‌بێ كه له كۆمه‌ڵێك بوعدو خاسیه‌ت پێك هاتووه ، هه‌ر ئه‌و ماهیـه‌ته‌ش كـه ته‌سـه‌وری ئینسان له خودی ئینسان دا ده‌كات ، بێ گوێ پێدانـه تاكـه جیاوازه‌كانی مرۆڤ له‌و به‌شـانه‌ی كـه له ماهیـه‌تی ئینستانـا گۆرانێكی جه‌وهه‌ری ناگۆرێن .

كه‌واته بناغه‌ی گشتی وجودیه‌ت ، بـاوه‌ر نه‌بـوونه بـه وجودی ماهیه‌تێكی پێشینه ، له‌مه‌وه رێبازی وجودیه‌ت ئه‌گاته ئـه‌و قه‌نـاعه‌تـه‌ی كـه هـه‌ر ئینسـانـه ئـه‌تـوانێ له خیـلالی وجوده‌كه‌یـه‌وه ، ماهیـه‌تی خۆی بسـه‌لمێنێ ، واته نمـوونه‌ی به‌رزی ئینسان ، ئه‌مه‌ش به رزگار بونێتی له هه‌موو بیرو باوه‌ره ئه‌خلاقیو روحی‌یه بۆ ماوه‌كانو به‌كارهێنانی ئه‌قڵی له ته‌حدید كـردنی هـه‌ڵسو كـه‌وتـه‌كـانی ، له‌هـه‌ر هـه‌ڵوێستێـك له هه‌ڵوێسته‌كانی ژیانی‌دا .

ئا له‌م رێبازه‌وه شانۆنامه وجودی‌یه‌كان به‌دیاركه‌وتن ، كه سارته‌رو هه‌ندێكی‌تر له بنووسه وجودی‌یه‌كان نووسیویانن .

له‌و ساڵانه‌ی دواییشدا جیهان شۆرشێكی نوێی ، نه‌ك ته‌نها له‌سه‌ری هونه‌رو ئه‌ده‌ب به‌خۆ بینیوه ، به‌ڵكو شۆرشه‌كه ژیـانی گرتبـۆوه‌و هونـه‌رو ئه‌ده‌بـه‌كه‌ش وه‌ك چـالاكی‌یـه‌كی دانه‌براو له ژیانه‌كه له‌گه‌ڵیدا هه‌ژا .

دله راوكێی مـرۆڤـو لاوازی ئیـراده‌ی بـه‌رامبـه‌ر چاره‌نووسو ده‌رك پێ‌كـردنی كاره دژ بـه مرۆڤـایه‌تی‌یـه‌كان سیمایه‌كی دیاری ئه‌و بزووتنه‌وه‌یه بوون .

بـه‌هۆی نـامه‌فهـومیو بێتوانـایی تێگـه‌شتن له‌و دوا دوزه‌خی‌یانه‌ی كه بۆ مرۆڤایه‌تی ئه‌نـرایه‌وه ، هـه‌ندێـك له ، رۆشنبیرانو هونه‌رمه‌ندان بروایان به ناماقوڵی ژیان هێنـا ، واتا له تواناادا نه‌بوونی ئینسان بۆ تێگه‌یشتنو ئاشكرا كردنی هۆكانیو راڤه‌كردنی ئه‌و نه‌هامه‌تی‌یانه‌ی كـه به‌سـه‌ر مرۆڤـا دێن .

شانۆی ناماقووڵ وه‌ك شۆرشه له‌دژی ژیانه‌كه ، یاخی بـوونێكی بێـزراو نـائـومێـدیشـه له بـه‌رانبـه‌ری دیـارده‌و هه‌ڵوێسته‌كان ئه‌مه جگه له‌و یـاخی‌بوونـه‌ی كه له دژی وێنـه ته‌قلیدی‌یه‌كانی دراما نواندی .

له‌به‌ر ئه‌وه‌ی ژیانه‌كه ، به حوكمی هه‌وڵو كۆششی له‌بن نه‌هاتووی ئینسانو مه‌ودایه‌كی زیاتری په‌ره‌سه‌نـدنو به‌ره‌و پێشه‌وه چوون به خۆیـه‌وه ده‌بینێو دره‌ختی مرۆڤـایه‌تی بـه ده‌ستی داهێنه‌رانه‌ی ئه‌و ئاو ئه‌درێ ، ئه‌وا ئه‌و جۆره بیروراو بۆ چوونه‌یانه ناتوانن تا مـاوه‌یه‌كی زۆر له‌گـه‌ڵ ئه‌و ژیـانه‌دا بژین ، ئه‌مه له‌و كاته‌دا كه هونه‌ر ، نابێو ناگونجێ ببێته شتێكی بێزارو نائومێدی نامه‌فهومو ره‌ش‌بین ، هه‌روه‌ك ئه‌وه‌ی پێویسته پاش به‌ندی ئێشو زامه‌كانی مرۆڤایه‌تی بێو رووناك بینانـه سه‌یری گرێ كوێره‌كان بكاو هه‌وڵی كردنه‌وه‌یان بدا .

دیاره ژیانه په‌ره‌سه‌ندووه‌كه پابه‌ندی ئه‌و جۆره ئه‌ده‌بو هونه‌ره‌یه‌و هه‌ریه‌كه‌یان ته‌واوكه‌ری ئه‌وی تریانن ، له‌ته‌ك هه‌ر په‌ره‌سه‌ندنو گۆرانێكدا ، ئه‌ركی هونه‌ره‌كه ده‌چێته قۆناغێكی تره‌وه‌و به شێوه‌یه‌كی دی ته‌عبیر له‌و بارو حاله‌ته ده‌كات .

بـه‌و جـۆره ، له‌وانـه‌ی بـاس‌كـرا ، پـه‌ره‌سـه‌نـدنی هونه‌ره‌كانی شانۆمان له ره‌وتی پـه‌ره‌سه‌نـدنه گشتی‌یـه‌كه‌ی مرۆڤ‌دا بۆ به‌دیاركه‌وت هه‌روه‌ك ئه‌وه‌یان بۆ روون بۆوه كه ئه‌و په‌ره‌سه‌ندنو به‌ره‌و پێش چوونه ، له‌سـه‌ر بنه‌چـه‌ی توخمـه هـونه‌ری‌یـه رووته‌كـان به‌دی نـه‌هاتـووه ، هـه‌ڵبـه‌تـه ئـه‌و په‌ره‌سه‌ندنه شان به‌شانی گۆرانكاری‌یه‌كـانی مرۆڤـایه‌تی له لایه‌نه‌كانی رۆشنبیریو كۆمه‌لایه‌تیو رامیاری‌یه‌وه به ئـاكام گه‌یبوو‌و له‌ته‌ك ئه‌ماندا هه‌نگاوی گه‌شه‌و به‌ره‌و پێشه‌وه چوونی داوه .

---

سه‌رچاوه‌كان


1 - ضرورة الفن - آرنست فيشر
2 - المسرح العالمي - د . محمد مندور
3 - الادب و مذاهبه - د . محمد مندور




# شیرینێ لەیلانێ

هەلبەست و ئاوازی : فۆلکلۆری
ئامادەکردنی : وریا ئەحمەد
گوتنی : تایەر تۆفیق

قەسەم بەو بالای چین چینت
بەم ئەگریجەی ژێر پۆشینت
کافربووم هاتمە سەر دینت
شیرنێ لەیلانێ لەیلانێ
شیرنێ با بچینە سەیرانێ

* ● *

چاوی ڕەشت بە خومارەوە
مەمکت سیوە بە دارەوە
خوا پێی داوی مەی شارەوە
شیرنێ با بچینە سەیرانێ

* ● *

جووتێ ساقی گوارە زێڕین
مەی لە مەیخانێ دەگێڕن
عاشقان لە دین وەردەگێڕن
شیرنێ با بچینە سەیرانێ

* ● *

قوربانت بم ئەی بای شەوێ
خەوبێ لە چاوم ناکەوێ
دڵ مەجنوونە لەیلای دەوێ
شیرنێ با بچینە سەیرانێ
شیرنی لەیلانێ ....

---

● ئەم گۆرانی‌یە سالی 1977 بە یارمەتی تیپی هونەری هەولێر بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك تۆمارکراوە .

# بەناز گیان

ئاوازو هەلبەست : فۆلکلۆری
ئامادەو دابەشکردنی : وووریا ئەحمەد

ئەرێ چەندم پێ ووتی : گیانە بە تەگبیرم بی
ئەرێ بەقسەو نەکردم : نازەنین خودا گیرم بی
ئەرێ بەناز گیان بەناز : کچێ بەنازت کردم
ئەرێ مندالی دوێنێم : گیانە تۆ پیرت کردم

* ● *

ئەرێ هێشتا لەگەلما : گیانە دڵ پڕ لە قینی
کچێ موبارەکت بێ : گیانە ئەلقەی بوکێنی
ئەرێ بەناز ....

* ● *

ئەرێ چەن سال بەتیری : نازەنین عەشقت ڕەنجەڕۆم
ئەرێ ئەوا لە داخت : گیانە باردەکەم دەڕۆم
ئەرێ بەناز ...

* ● *

ئەرێ هەرکەس عاشقە : جوانێ وەکوو من نەبێ
کچێ گیرۆدەی : داوی جوانێ پەڕەی دڵ نەبێ
ئەرێ بەناز ...

* ● *

---

ئەم گۆرانی‌یە بە یارمەتی تیپی هونەری هەولێر لە سالی 1977 دا تۆمار کراوە بۆ تەلەفزیۆنی کەرکوك ..

كورته چيروك

# كەچەلۆكێ

● محمد عبدالله ●
دهوك

1983/7/5

دبێژن جارەكێ سێ مروڤ هەبوون هەرسێ برايێت ئێك بوون هندی برایێ بچويك بوو ناڤێ وی [كەچەلوك] بوو . كەچەلوك نەدشيا شول‌كەتو حەز ژ شولی نەدكر هندی برايێت وی دبەرا دكرو دگوت كو شول‌بكەت نەهەرێ شول‌نەدكر ئينا رۆژەكێ برايێت وی گوتێ برا ئەگەر دێ شۆل كەی تو لسەر چاڤێت مە روينەخوارێ ئەگەرژی شول‌نەكەی دونيايا بەرفرەيە چ عەردێ بخۆ دچيێ هەرێ ئەم تە ناحەوينين . كەچەلوك رابوو كەرێ خۆ كۆرتان‌كرو كنجرێت خو هاڤێتنە سەر پشتێ‌و ژنكا خو دا بدويڤ خو قەستا بنێ باژێری كر كەر كولكەك بخو ڤەوژارت‌و كنجرێت خو هاڤێتنە تێڤە چەند روژەك پێڤەچۆن كاروانێت گوندی كارێ خو كر دا بچنە كاروانی كەچەلوكی هزرێت خو كرن‌و گوت ئەرێ حورمەت ما نە چ تشت نينە ئەززی بچمە كاروانی دگەل كاروانی‌يا ؟ ، ژنا وی گوت باوەر بكە جوامێرۆمە تشتەك لناڤ تشتەكێ نينە ما دێ چ بەی ؟ ! مێركی گوت حورمەت كا تو رابە جوتەكێ جوالكا [تێر] بينە هەما ئەژی دێ‌چم بلا چ نەبيت ژنا ويژی گوتێ كۆرۆ مال‌خراب ما ئەگەر مە چ نە بيت دێ دەست‌ڤالا چی‌يە كاروانی ؟ ؟

كەچەلۆكی‌ژی گوت دێ رابە حورمەت ئەژی دێ هەردو تێركا تەژی زبل كەم بەلكی خودێ‌يە بو مە تشتەك پێڤە بهێت ئەم هەژارين ما چ بكەين مە چ دی نينە ، ژنكا ويژی هەرويكاڤێ رابوو جوتەكێ جوالكا بو ئيناو ئەويژی هاڤێتە سەر پشتا كەرێخوو بدويڤ كاروانيا كەت زبلێ گرانە كەرێ ويژی گەلەكێ بێچارەيە مغدارەكێ چوون كەرێ وی وەستياو كاروانی‌يا هێلا ما برێڤە كەهشتە سەرێ زيرەكێ لبن باژێری ئاميدیێ‌دا بارێ كەرێ خو هاڤێت كورتانێ وی ژێڤەكرو بەردا وێرێ بەرەك دانا بن سەرێ خوو خورپ‌و دخەوچوو ..

هێژ يێ دخەوە كاروانەكێ مەزن هات‌و لێ نزيك‌بوو بەرێخودەنێ كو مروڤەكێ لبەر رەخێ رێ نڤستی‌يەو بارەكێ داگرتی‌يێ برەخڤە ، سەرۆكێ كاروانی گوت راوەستن ئەم دێ‌چين سەحكەينێ كا ئەو چی‌يە د بارێ ويدا ؟ ! هندەكا خو نزيكی جوالا كر تلێت خۆ گەهاندنێ‌و گوتە سەروكێ كاروانی باوەربكە ئەڤە هەمی [طوڤ‌چايە] ئينا سەرۆكێ كاروانی گوت كا هوين بارەكێ پەرۆكا داننە وێرێ‌و بارێ وی بينن بارەكێ پەرۆكا بۆ هاڤێتە وێرێ‌و بارێ زبلی باركر . چەند وەختەك پێڤەچوو كەچەلوك هشياردبيت بەرێخوددەتێ بارێ كەرێ وی يێ‌هاتيەگوهرين هەر سڤك رابوو چو بەرێخوبدەتێ چو هنداڤی بارێ دەرێت جوالا ڤەكرن بەرێخو ددەتێ هەمی پەرۆك [كوتاڵ] كەيفا وی گەلەك هات هەروێ گاڤێ كەرێخو ئيناو كۆرتان هاڤێتە سەر پشتێ‌و تەنگا وی لێ شداند بارێ خو باركرو قەستا مال كر .. نزيكی مال بوو ژنا وی هاتە پێش ڤە بەرخوددەتێ بارەكێ پەرۆكا يێ ئيناى ژ هەمی رەنگا كەيفا وێ گەلەك هات ئينا گوتێ ئەرێ جامێرو مال‌خراب ئەڤە تە ژ كيش فەقيری دزينە كەچەلوكيژی چيرۆكا خو هەمی بۆ گوت ئو گوتە ژنا خۆ هشياربی بو برايێت من نەبێژی تە شوله ب من‌و وان نينە ئەويژی گوت سەرچاڤا ، هەردوو برايێت كەچەلوكی زانی كو كەچەلوك يێ چويە كاروانی‌و زڤری‌يەڤە ئو بارەكێ مەزن قوماش‌ژی يێ‌ئيناى ئينا هەردوو رابون قەستا نيك برايێ خۆ

ـ میز دویربوون کەچەلوك پیشڤەچو برایێت وی هاتن ـنەخواری ئو گوت ئێ برا کەچەلوك شەقی‌زەحمەتا تو ـ کویری چوی ؟ تە ئەڤ پەروکە ژ کویڤە ئینان ؟ ؟ ـوکی ژی گوت برا هەرچەندە هەوە ئەز ژ مال دەرئێخستم ـ هەوە ئەزل کولانیت خەلکی‌را رەزیل‌کرم بەلێ پا چ بکەم هوین ـ برایێت منن من بڤێت‌و نەڤێت .. ئو ئەز چ ژ هەوە ـ شیرم ، کەچەلوکی گوتێ گەلی برا ئەز چوم داچمە بازیری ـ یێ بەری بگەهمە بازێری جادەکا لویرێ هەی هەمی ـ نی لویرێ باریت دەواریت خو پەیت‌دکەن‌و کوم‌دبن‌و خو ـ قلیت خو دگرن ئەژی چومە ویرێ من گازی‌کر هێ ...

زبل ب پەروك هەروێ گاڤێ من باریخو گوهری‌و ئەز ـ ڤریمەڤە .. برایێت وی‌ژی گوت مادەم وەسا بیت بخودێ ئە ـزی دێ‌چین هەر ویگاڤێ هەردوو برایێت وی رابوون هەرئێکی ـ واریخو ئینا دەرو کورتان هاڤێتە سەر پشتێ‌و باریخوي زبلی ـ کرو قەستا بازێری ئامێدیێ کر چونە سەر وێ جادێ ئەوا ـ رایێ وان نیشادای دەواریت خو راوەستاندن‌و گازی‌کر هێ زبل ب پەروك چوار پینج جارا هەر گازی‌کر دوو سێ گەغەك ـ بەرا بورین گوهێ خودایێ گوتە ئێك‌ودوو ئەڤە چ مروڤن ؟؟ ـ یارە ددینن .. نەخێر هەر گازی‌کر ئینا هندەك چونە نزیك‌و گوتنێ مال‌خرابین ما هوین دین‌بوینە کەسی زبلی دکریت ب پەروك ـ ردوکاژی گوت مالا هەوە خرابە هوین ددینین ئەوانژی نەکرە نەمەردی لرەخا کوم‌بون‌و هجەت قوتان هەردوکا دەواریت خو هیلان‌و برف مال چون‌و گوتن سوزبیت گەر ئەم گەهشتینە مال ئەم برای خو بکوژین ... کەچەلوکی چ کر گازی ژنا خوکر گوتێ حورمەت دێ نوکە برایێت من هێن ئو یێ خو کارکری بو کوشتنا من ڤێجا ئە زدێ جلکێت تە کەمە بەرخوو تو جلکێت من بکەبەرخوو هەرە پشت کارا خو ڤەشیرە ئەژی دێ گیسکی هەلگرم‌و مالی مالم بەلێ هشیاربە گەر هاتن خو تە بکوژنژی دەنگ ژ تە نەهێت .. هەر دوێ گاڤێرا هەردوکا خو گوهری‌و ژنك چو پشت کاراو میرك گیروبو بمال‌مالشتنێ‌ڤە برایێت وی هاتن‌و یێ بشەرن سەری وان یێ دخوینێ وەرکری بشەرڤە گازی‌کرکا کەچەلوك بخودێ دێ خوینا وی ڤەخوین کەچەلوکیژی دەنگێ خو زراڤ‌کرو گوت هەرن یێك پشت کارا ئەوژی چون ل ژنا وی راوەستیان بمیرحتا هەتا ئێخستی ویرێ‌و کوشتی ئینا ریکا خو گرت‌و دەرکەڤتن کەچەلوکی گوت مانێ ئەڤان ژنا من کوشت سوزبێتن ئەڤە بو وان نەچیت‌و تولا خو هەر دێ لێڤەکەم . کەچەلوك رابووکەری خو ئیناو کورتانێ وی دانا سەر وەریسەك ئینا ئو ژنکا خو ژ خوین‌ڤە لسەر پشتا کەری زەبتکرو گریدا ئو لبازێری دەرئێخست ... هەر چوو هەتا گەهشتیە نیزیکی بێدەرەکا گەنمی‌و گەنم هەمی‌یێ سورکری‌یە لسەر ئەویژی کەری یخو بەردا سەر گەنمی ئو چو پشت تەراشەکێ لنزیکی بێدەرێ ژ قەستاڤە دوخینیت خو ڤەکرن‌و رونیشتە خوارێ .. خودانێ بێدەرێ لمال‌را چاڤ بوی کەری کەڤتن کو یێ لسەر گەنمی‌و مروڤەك یێ لسەر پشتێ ... هندی لمالرا گازی‌کری خودانێ کەری ئەو گەنمێ بخودانە چاوا تە کەر بەردایە سەر نەخێر هەروەکی چنە هەتا نزیك‌بوی بەریخودەتێ ژنکەکا لسەر پشتا کەری هندی گازی‌گرێ خویشکا من کەری خو پاژو ئەو گەنم هەمی خوار نەخێر ژ قەستابوو ئەویژی نەکر نەمەردی لبەر ژنکێ راوەستیاو بەرەك لبن گوهێ وێ داو د کەریدا ئیناخوار ...

دەمێ ژنك د کەریدا شوربوی کەچەلوك سڤك پشت تراشێ رابوڤەو کرەهەوار ما چ خودێ قەبویل‌دکەت تە ژنکا من کوشت نێ یا کەرەو لالەو کورەیە تە چاوا وەلێکر ؟؟ دەمێ میرکی ئەڤ تشتە گولێ‌بوی شاش‌بوو هەما ماراوەستیای ئینا گوتێ بەختێ خودێ بەس تو دەینەکە تە چ دڤێت ئەز دێ دەمەتە .. کەچەلوکی گوت ئەز ناراوەستم ئیللا تەژی بکوژم میرکی گوت ئەز کەتمە سەر بەختێ تە یاتە ئەوە ئەز بو تە ژنەکا دی بینم ئینا کەچەلوکی گوت مادەم وەسا بیت ئەزێ رازیمە هەروێ گاڤێ کەچەلوکی ژنا خو بم‌ئاخ‌کرو ڤەشارت‌و بدوین خودانێ بێدەرێ کڤت‌و قەستا مالا وی کر .. گوتە کەچەلوکی من کچەکا هەی وی‌ژی دێ دەمەتە کەچەلوك هەروێ گاڤێ چوو دەستێ خودانێ بێدەرێ‌و کچا وی بخوژێ قەبویل‌کرو بپشتا کەری خو سیارکرو قەستا مال کر برایێت کەچەلوکی زانی ژن برا خو بوو کوشتی نەکو برایێ وان بوو ئو زانی برایێ وان یێ زڤری‌یەڤە ژنەکا گەلەکا جوان یا بخو ئینای برایێت وی گوتە ئێك‌ودوو مە گەلەك غەدر ل برایێ خوکر مە ژنکا وی کوشت لسەر مە پلتڤی‌یە ئەم بچین خو پاڤێنیە ناڤ مالا وی بەلکی ل‌مە نەگریت ئەو تشتێ مە کری هەردوو رابون قەستا نیك برایێ خو کر هیش ژ دیرڤە خو رەزیل‌کرن هەردوکاو گوت برا مە کرو تو

نەکە تو چ دبێژی ئەم دێ وەکەین بەس ڤێجارێ تو لە نەگرە ئینا کەچەلوکی گوت نە برا نە خو تویرەنەکەن خوزی هەوە زیتر ژنکا من کوشتبایە چونکی ژنکا من پچەکیا پیربوو من بخو دا ب ئێکا جەجێل تر ... ئینا برایێت وی گوت کوڕا کەچەلوک چەوا تە ژنکا مری دا ب ئێکا ساخ نێ ئەڤ تشتە چ جارا چێنەبویــە .. ئینا کەچەلوکی گوت نە برا نە هوین مزانن جهەکێ هەی لنــزیکی بازێڕێ ئامێدیێ مری ب زیندی دگوهڕن بەس هوین دەوارێك خو راوەستینن لسەر جادێ هەما گیرونابن هوین ئینا هەردوکا گوت بخودێ ئەڤە خوش شولە چونکی ژنکێت مە هەردوکاژی پیچەك دهیرن هەردوو رابون چونە مال ئو ژنکێت خو کــوشتن و لسەر پشتا دەوارێت خو زەبتکرن و قەستا بازێڕێ ئامێدیێ کرن چونە سەر روێ جادێ ئەوا برایێ وان کەچەلوکی گوتی ، دەوارێت خو راوەستاندن و گازیکر هێ مری ب زیندی ، هەرچیێ دوێرێڕا بوری گوهێت وان بەل بون و گوت باب و ئەڤە ددینن هەتا ئێڤاری مان بهێن کەتە وان هەردو کەلەخــا هندەکێت بهــێن کورت ژی دوێرێڕا بورین بەرێخودەنێ حال ئــەڤەیــە گەلەك تــوڕەبون و لێزڤڕین هەردو ئێخستنە ویرێ هندی قوتان ئەوژی تەرمێت خو هێــلان و سوینــدخوار ڤێجــارێ ئەم بــرایێ خو هــەر بکوژین کەچەلوکی هزرێت خوکرن ، گوت ڤێجارێ ئەز هەر چوم چونکی برایێت من هەردوو کا ژنێت خو کوشتن ڤێجارێ گەلەك ژ من دداخن ئەز قورتال نابم هەما بلا من بکوژن یێ ڤان ئاخفتنــا دبێــژیت هەردوو بــرایێت وی لبەر دەرگــەهی ئامــادەبوون ، هەردوکا هێرش برە سەر برایێ خو و گرت ، دارەکا گەلەکا مەزن لپشتا گونــدی هەبــوو ، کەچــەلوك بر ل وێ دارێ ئێشــك دا دەست هاڤێتێ دا ئاگری بەردەنێ سەح دکەنە خو ئاگرو گــاز هەردوونە ئینانە ئینا رابون دارو تڕاش کومکــرن و بڕەخێت برایێ خوڤە نان ئێکێ گوت ئەز دێ چمە گازێ تو هەڕە ئاگری ، چو ئاگری و یێ دی چو گازێ .. شڤانەك هات بەرێخو دەتێ کو زەلامــەکێ بدارێڤــە گرێــدای ئو ڕەخێت وی هــەمی دارێت پێڤەنای و یێ سترانا دبێژیت شڤانی گوت مال کــاڤل بێهنــا تە کورت بو ب ڤێ دارێڤەو تو یێ ستراناد بێــژی ، کەچــەلوکی گوتێ هەڕە هەڕە مام و تە شولە ب من نینە گەر تو بزانی کو ئەز بوچی یێ بڤێ دارێڤە گرێدایم دێ بێژی ئێللا ئەز دێ هێمە شوینا تە ، شڤانی گوتێ تو بوچی گرێدای ؟؟ کەچەلوکی گوتێ مال وێران منێ خو گرێدای بڤێ دارێڤە بێهنەکا دی دێ دوو مروڤ هێن ئێکێ گازا ڤێ و یێ دی ئاگر ئو دێ ئاگری بەردەمە من تو یێ من دبینی ئەزێ پیرم پشتی دسوژم دێ ژیێ من هێتە چواردێ ئیناشڤانی گوت ئەز کەتمە سەر بەختێ تەو خــودێ ئەگەر تو نەهێیە شوینا من ئەز بهێمە شوینا تە ئو پەزی من ژی هەمی بو تە مروڤەکێ بێ ژیر بی خولێ سەری ئینا کەچەلوکی ژی گوت مادەم تە ئەڤ سویندە دا بەر من ئەز نەشێم دلێ تە بشکێنم بەس وەرە دەستێت من ڤەکە بەس هشیــاربی دەمێ ئاگری بەردەنە تە دەنگی ژ خو نەنینی ، کەچــەلوکی شڤانــە لشوینا خو گرێدا ئو پەزێ شڤانی دا بەریکا خو قەستا مال کر برایێت کەچەلوکیژی هاتن بەرێ خو نەدا سەروچاڤا کا کیە کی نینــە !! چــونکی کــەچــەلوکی و شڤــانی جلکێــت خــو پێك گوهری بوون ، گاز هاڤێتێ و ئاگر بەردایێ هندی کرەهەوار ئەز ئەو نینم نەخێر سوت و بو ڤێر هەردوکا گوت ئێ ئەم ژ ڤی قورتال بوین ، ئو زڤڕینەڤە مال بەرێخودەڤێ کەرەکێ پەزی یێ لبەر دەرگەهێ خانیێ برایێ وی چون سەحکەنێ کا ئەو پەزی کێیە دەمێ نزیك بوین بەرێخوددەنێ کو برایێ وان یێ فراڤینێ دخوت ، ئینا گوتێ کەچەلوك مال خراب ما مە تو نەسوتی نوکە ، کەچەلوکی گوتێ برا هوین نزانن ئەو دار دارا [ئێغبالێ] یە هەر چ کەسێ پێڤە سوت دێ تشتەك بیتە ڕزقێ وی ڕزقێ من ژی پەز بوو من ئینا برایێت ویژی گوت ئەم هیڤی دکەین برا مەژی پێڤە گرێدە ئەم خودان عەیالین کەچەلوکی گوتێ سەرچــاڤا چــونە ویرێ برایێ مەزترێ ب دارێڤە گرێداو ئاگر بەردایێ و سوت و کرە ڤێر هندی خول هیڤی یا وی گرت نەخێر چوو نە زڤڕی ..ئینا برایێ کەچەلوکی گوتێ ..کا ؟ ! برایێ مە نەساخ بووڤە ، ئەڤە چ لێ هات ؟ ! کەچــەلوکی گوتێ بــرا بسەرێ تــە ئەز چ لتــە ڤەشێرم سوت و چوو ... ئەگەر تەژی بڤێت بسوژی فەرمو دا تە گرێدەم ئینا برایێ وی گوتێ برا ئەز کەتمە سەر بــەختێ تەو خودێ من کرو تو نەکە نوکە پاشڤە ئەز برایێ تەو تو برایێ من هەردوو چونە سەروستــوییێت ئێك ودوو ئــو پێك هــاتن زڤڕینــە مال ...

---

ئاڤر

ئەڤ چیروکە من یا ژ برادەر [فەهمی عەبدولا]ی وەرگرتی کو خەلکێ گوندێ [بەلاڤ]ە یە ل دەڤەرا ئامێدیێ و ژیێ وی نزیکی ٤٠ سالایە ...




● حبيب سعيد محمد ●
زاخو

جارەکێ ژ جارا ڕەحمەت ل دەیبابێت «گوهدارا» حـــەڤانا دبێژن :ـ

لدەمێ بەرێ حاکمەك یێ ل باژێرەکی بوو ، خلتەکێ گەنەکێ گران ئەڤ حاکمە گرت ، هندی لنگ حەکیم و لوقمان و حتورا گەڕهاو ئینا نە پێش خلتێ خوە ، کەسێ چ چارەو دەرمان بو نەدیتن .

دبێژن ڕۆژەکێ ڕێکا حەکیمەکی ژی دوی باژێری ئەشقلی ، خەلکێ گوندی ژی جاب دا حاکمی ، حەکیمەکێ نوی یێ هاتیە باژێری تە ، دێ کا بلا بێتە پێش نەخوەشیاتە ، بەلکی دەرمانەکی بو ببینیت ، ئینا حاکمی جابا حەکیمی ڤرێ کر ، حەکیم هات وێرێ ، حاکمی گوتێ : ئەی حەکیم هەگەر تە دەرمانەك بو خلتێ من دیت ئو ئەز پێ ساخ بووم و بسەر خوە ڤە هاتم ، تە چ دڤێت ئەز دێ دەمە تە .

پشتی حەکیمێ مە حاکم فەحس کری ، باش هزرێت خوە دئێشا ویدا کرین ، سەرێ خوە بلند کرو گوتێ : یا لحاکمی خوەش بیت ، دەرمانێ تەیێ هەی بەلێ گەلەکێ بزەحمەتە ، حاکمی گوتێ یا حەکیم چ دەرمانە یێ بزەحمەت ، کا بێژە بئانەهیا خودێ چەندێ ئاسێ بیت دێ هەر پەیدا کەم ، حەکیمێ مە گوت حاکمی ، ئەزبەنی هەگەر تو بچویکەکێ ساڤا سەر ژێ بکەی ، خوینا وی د لەشێ خوە بدەی بئانەهیا خودێ دێ ساخ بی ، وەختێ حەکیمی وەگوتیە حاکمی ، هەکەر حاکمی تشتەك دای حەکیمی هەکەر نەدایێ ، گازی دلالێ خوە کرو گوتێ : دەنگ ل باژێری بدە ، کا کێ بچویکەکێ ساڤا یێ فروتنێ هەیە ، بلا بومن بینیت ، چەند پارە بڤێن دێ دەمێ ، ئینا دەلالێ گازی کر : هو ... گەلی ئەهلی باژێری . کێ بچویکەکێ ساڤا یێ فروتنێ هەیە بلا بو حاکمی بینیت چەند بڤێتن دێ دەتێ ، دەلالێ ڕەبەن هندی گازی کر ، کەسێ دەی نەکرو چ بچویك بو نە ئینان ، ما کی دێ کوڕێ خو ، ئان کچا خوە دەتن بخوە بمالێ دنیایێ ژی هەمیێ ، دەلال بێ هیڤی بو ، هات گوتە حاکمی : ئەزبەنێ کەسێ دەینەکر ، حاکمی گوت دەلالی دێ ڕاوەستە ، بەلکی حەتا ئێڤاری ئێك پەیدا ببیت .

ژنکەك و میرکەکێت هەژار و دەست کورت یێ ل باژێری ، شیڤا شەڤێ دناڤدا نینە ، کوسکەك «بڕەك»ا عەیالێ هویر یا هەی ، هەژاری هزرێت خوە کرن و گوتە ژنکا خوە : فلان کەس ما بوچی ئەم کوڕکێ خوە یێ پێنج شەش هەیڤی نادەینە حاکمی ؟ هەکە ئەم هەمی دێ ژبرسا مرین ، بلا ئەو بتنێ بیت ، ئەم ئەڤێت دی دێ ڕحەت و تەنا بو خوە ژین ، ئینا ژنکێ گوتێ :

بخودێ ئەڤە خوەش ڕێکە ، مانێ ئەم هەمی هەر درەزیلین ، هەما مە گرتی مە ئەو گوڕ نینە ، بلا ئەم ئەڤێت دی ژڤێ بەلنگازیێ دەرکەڤین .

هەژاریمە کوڕکێ خوە کرە ملێ خوە قەستا حاکمی کر ، چو دیوانێ سلاڤ کرێ ، سلاڤاوی ژی وەرگرت ، حاکمی گوتێ : خێربیت هەژار ، هەژارێ مە گوت : یا ل حاکمی خوەش بیت ئەڤ کوڕکێ ساڤا من یێ بوتە ئینای ، حاکمی گوتێ : هەی نەنە ؟ هەژارێ مە گوت بەلێ وەلا ئەزبەنی ، حاکمی دوجارا کوڕك لبەر زێڕا کێشا دانە هەژاری ، گازی جەلادی کر وەرە ڤی کوڕکی سەر ژێکە ، دا خوینا وی د لەشێ خوە بدەم بەلکی خودێ بکەتە دەرمان ، جەلادێ کوڕك ڕویس کر دا سەر ژێ کەت ، کوڕکێ ساڤا کر کەنی .. ! حاکمی گوتێ : ئەی تفال ، ئەم دێ تە سەر ژێ کەین ، تو بچ دکەنی ؟ !

کوڕکی گوتێ : ئەز یێ بڕەحما خودێ دکەنم ، حاکمی گوتێ چاوا ؟ کوڕکی گوتێ بەلێ وەلا یا ل حاکمی خوەش بیت ، پانێ ئێك دێ زوّر داریەکێ لمروڤی کەت دێ مروڤ هەوارا خوە بەت دەڤ بابێ خوە ، ئەڤە بابێ من ئەز یێ فرویتم تە ، پشتی هینگێ مروڤ دچیتە نك قازیێ باژێری ، ئەڤە وی ئەز بو تە حەلال کرم ، پاشی دێ مروڤ هەوارا خوە گەهینیتە دەڤ حاکمی ، ئەڤە ئەز دەرمانێ ئێشا تەمە ، ڤێجا ما چاوە ئەز نەکەنم ؟ !

ئینا دلێ حاکمی بو کوڕکی کوزری ، گوتە جەلادی ڕاکە نە سەر ژێکە ، ئەز مرم خوەزی پار دمرم ، گوتە هەژاری «بابێ کوڕکی» وەرە کوڕێ خوە ببە بلا پارەژی بوتە بن ، ئەهلێ دیوانێ گوتی : ئەزبەنی پیچە خوینێ ژ تلا وی بینە د لەشێ خوە بدە بەلکی ساخ ببی کوڕك ژی نامرین ، ئینا حاکمی گوهێ خوە دایێ هندە خوین ژ تلا کوڕکێ ساڤا بەرداو د لەشێ خوەدا خودێ لێ کر دەرمان حاکمێ مە ساخ بوو ، کوڕکێ مەژی یێ بێ دەڤ و ئەزمان ژ کوشتنێ خلاس بوو ، هەژارێ مەژی ڤحال کەت حالێ وی خوەش بوو ڕەحمەت ل دەیبابێت خاندەڤانا .

# بەیتی سەیدەوان

کەمال ئەحمەد دۆڵپەمووبی
سلیمانی

1983 / 6 / 19

عەبدول عـەزیزی داسنی ، لە نـەوەکانی عـەلی بەگی داسنیٚ‌یەو عەلی بەگ خەڵکی عەقرەیە ، کە لە شارە کۆنەکانی کوردستانی گەرمیانەو فەرمان ڕەوای کردووە تیایا .

عەلی بەگی داسنیٚ لە ساڵی «1274»ی کۆچیدا لە شەڕێکدا کە لەگەڵ میر محمد پاشای ڕەواندزیٚ یانی لەگەڵ میری گەورە کردویٚتی کوژراوە .

دەتـوانین بڵێن عـەبدوڵ عـەزیزی نـەوەی عەلی بـەگ ئەمەری‌ی تێ دەچیٚ کە 20 ساڵ دوای عەلی بەگ فەرمان ڕەوای عەشایەری داسنیٚ‌ی دەستکەوتبیٚ . ئەوە نیشانی دەدا کـە تەمەنی بەیتەکە پاڵی بە 120 ساڵێکەوە داوە ، هەروەها بەیتەکە نیشـانی دەدا کـە لە مـەڵبـەنـدی هـەرێمی داسنیـان واتـە کوردستانی گەرمین ڕووی دابیٚ .

بە داخەوە لە بەیتەکەدا ژیانی عـەبدول عـەزیزی تیـا باسکراوەو نە بەیت بیٚژەکە ناوی خۆی وەدەربڕیوە ، بەڵام لە چەند جیٚگاڕاوی بزنە کیٚوی‌و مەڕە کیٚوی بـە تفەنـگ کراوە ، دەتوانین بڵێن کە تەمەنی بەیتە کە زۆر کۆن نیە ....

عـەبدول عـەزیزی داسنیٚ سیٚ کـوڕی بووە بـە نـاوی نیٚچروان‌و مەلکەوان‌و سەیدەوان ... نیٚچروان‌و مەلکەوان لە تەمەنی گەنجی‌و لاویدا جوانە مەرگ دەبن .

بەڵام قەزاو قەدەری خودا واچارە نووس دەبیٚ کە ئەو کوڕەش لە دەس بچیٚ . جیٚ‌ی داخە بەچ چوونێك لە گەردنی گوڵی بەهاری تەمەنی دەدریٚ ـ عەبدول عەزیـز ڕۆژیٚ لەگەڵ سەیدەوان دەچیٚ بۆ شکاریٚ لە کاتیٚکدا کە دوای ڕانی بزنـە کیٚویان دەکەویٚ‌و خۆی سەنگەری داویٚ . لە لایەکی دیکەوە کوڕەکەی : سەیدەوان بزنە کیٚویان هەڵدەبڕیٚ‌و خۆیان لیٚ مات دەدا .

بەڵام قەزاو قەدەری خودا هەربەو جۆرە دەبیٚ‌و بایەکی توند سەروزوڵفی سەیدەوان ئاڵۆزدەکاو دەی شەمـزیٚنیٚ ... عەبدول عەزیزی باوکی وادەزانیٚ ئەوە مووو یاڵی بزنە کیٚوی‌یە ، دەس ریٚژی لیٚ دەکاو بە پرتاو هەڵدەکوتیٚتە سەری‌و وادەزانیٚ نیٚچیرەکەی کوشتووە . ئەریٚ نیٚچیرەکەی کوشتووە ؟ .. بەڵام زۆر جیٚ‌ی داخە چ نیٚچیرێـك .. نیٚچیرێـك کە تـەنها ئـاواتی باوکی‌بوو ، بە دەزگیران داری‌و جوانکەیی بە گوللەی باوکی سەری نایەوە . لە بەهاری جوانیدا پەڕ پەڕ بوو .

لە خوێنی خۆیدا شەتڵ کرا ... باوك هەروەك ڕۆستەم کە خـۆڵی وەسـەر دەکـرد قـوڕی دەپێـواو لە هـۆش چـوو ... مەبەستیٚکی زۆر جوان‌و ئازایانەی تیا بەدی دەکریٚ‌و بە تایبەت کوردانە لەو بەیتەدا دەبینریٚ .

عەبدول عەزیز کـاتیٚ دەزگیرانی بـۆ کوڕە گـەورەکەی گرت . کوڕە گەورەکەی مرد دەزگیرانی بۆ کوڕی ناونجی دانا ئەویش بەمراد نەگەیشت دیسان دای بە سەیدەوان‌یش ئەویش بەو جۆرە لەبەین چوو ، کوژرا .... لە پاش سیٚ کوڕ دەزگیران بەبووکی دەڕواتەوە بۆماڵی باوانی .

ئەمەش بەیتەکەیە پیٚش‌کەش بە خوێنەرانی هیٚژای دەکەین .

بەهارە چ بەهارێکە لە من بەغەللورە [1]
ـە من دەچمەوە سەر قەبری کاکە سەیدەوانی
ـە من شین دەبوو شەش پەڕوو شلێرو گەزیزەو نەورۆزە
ـەحەللا دەڵێی گوڵپکی دەستوورە [2]
ـەردبێ ئەمن لە پاش کاکە سەیدەوانی
ـە خۆم نابەستم تفەنگی شەش خانی
ـوبکەمەوە چیای مەغلووبی داسنیان ناکەمەوە ڕاوی
ـەکوورە ....

* * *

2 .... بەهارێك لەمن دادێ عەزیزەکەی لە دنیایەم
بەهارە فەسلێکە گیادەگرێتەوە ژەنگێ
خۆ من دەچمەوە سەر قەبری کاکە سەیدەوانی
لە بابی خۆی زیز بووە ناکاتەوە دەنگێ
خۆ من لەپاش کاکە سەیدەوانی
لە خۆم حەرام دەکەم ڕاوی دەکێوانی
کە جیا لە ڕاوی تفەنگێ .

* * *

3 ... بەهارێ لە من دادێ چ بەهارێکە لە من بە بەفرو بارانە
خۆ من ئەچوومەوە سەر قەبری کاکە سەیدەوانی
لە من شین دەبوو شەش پەڕو شلێرو گەزیزەو نەورۆزە
هـەرامەتی دانـە بە دانـە/شەردبێ ئـەمن لە پاش کـاکە سەیدەوانی لە خۆم نابەستم تفەنگی شەش خانە/ڕووناکە مەوە مەغلوبی داسنیان ناکەمەوە ڕاوی بەرانە کیۆیانە

* * *

4 ... بەهارێ لە من دادێ عەزیزەکەی لە دنیایەم
بەهارە چ بەهارێکە لە من بە ئالۆزە
خۆ من دەچوومەوە سە قەبری کاکە سەیدەوانی
لە من شین دەبوو شەش پەڕوو شلێرو گەزیزەو نەورۆزە
شەرت بێ ئەمن لە پاش کاکە سەیدەوانی
لە خۆم قایم نەکەم تفەنگی شەش خانی
رووناکەمەوە چیای مەغلووبی داسنیان ناکەمەوە ڕاوی
نێریە بەلەبۆزە .

* * *

5 ... بەهارێ لە من دادێ عەزیزەکەی لە دونیایەم
فەسلێ دەوڵەمەندان دەچنەوە کوێستانێ
خۆمن لە بۆت ئەوە هەردەڵێم دەزگیرانی ملکەوانی
سەری هەڵنایە لەبەر هەرامەتی شەدە لێ دانێ
بەهارە و چ بەهارێکە لە من شین دەنوێنێ
یاڕەبی خودایە ئەوە نە بکەی نەیسەبرێنی

* * *

6 .... بـەهارێ لە من دادێ عـەزیـزەکـەی لە دنیـایـەم
بەهارێکەو چ بەهارێکە لە من چەند دوورەکێ دیویەتی لە دەورەتی دەزەمانا
لە سەر سێ کوڕان ڕابووك بچێتەوە ماڵی دەبلوان هەرامەتی هـەر بەرروی دەسـوورە [3] بەهـارە چیـای مـەغلووبی داسنیان لە من بە لێژەو لە من بەتانە
هەرامەتی لە من بە بەرزە
خۆ من دەچوومەوە سەر جەنازەی کاکە سەیدەوانی
هەر دەخوێنی خۆی دەکەوزاوە .

* * *

7 ... بـەهارە چ بـەهارێکـە لە من دادێ عەزیـزەکەی لە دونیایەم
کەسانێ نەبوو بلێ عەبدول عەزیـزی داسنێ دەتفەنگێت وردبێ

چاو ی دەجاسوسێت کوێربێ کانی سوتەنت لە ئاو نیشتبێ
قامکی پەلان پیتکەت بشکێ
ئەوە کاکوڵی سەیدەوانی دەس پێدابارای دەژێنێ
ملکەوانم مرد دەنگم نەکرد نێچروانم مرد دەنگم نەکرد
سەیدەوانم بەدەستی خۆم کوشت ماڵی وێرانم
ملکەوانم ڕۆ نیچروانم ڕۆ
گەورەی هەزارو پێنج ماڵەی داسنی سەیدەوانم ڕۆ
تا ئەو ڕۆژەی میری مەزن دەگرێ دیوانی
مەجێ بلند سەیدەوانم ڕۆ

* * *

بەهارێ لە من دادێ عەزیزەکەی لە دونیایەم
بەهارەو چ بەهارێکە
لە من چەن گرانە عەبدول عەزیزی داسنی
ئەوە بانگ دەکات دەزگیرانێ
ڕوڵە وەرە مەرەخەسییە لە بابی خۆت بخوازە
ڕوبکەرەوە ماڵی دەبابانە
دەزگیرانی ملکەوانی ئەوە بانگ دەکا هەڵکێشە خەنجەری دەبانە
بیست و چوار جارێ بگێرەوە لە جەرگ و دڵانە
ئەمن لەسەر ملکەوان و نیچروان و سەیدەوانی ڕا بە چ
چلو ڕویەکی ڕوبکەمەوە ماڵی دەباوانە .

* * *

پەراوێز

«1» بە غەللورە ـ واتە بە تەم و مژە
«2» گوڵپکی دەستوورە ـ چەپکێ گوڵی پڕ بە چنگ
«3» هەر بە ڕووی دەسوورە ـ کچ بە ڕووی
سوورەوە چوتەوە ماڵی باوانی واتە بە بووکی




تو چ هزرا ژێ ناکەی . دێ بێژی ئەڤ مرۆڤە نەخویندەوارە ، لێ جاخێ دهلشکێڤی ژتەڕا خویا دبە ، کو خاندەڤانەکێ دەست هەلە لخاندنگەها تا پولا شەشێ خاندیە لسالێت بەری 1940 .

شەیدایێ هوزانا کوردیە . گەلەك هوزانێت هۆزانڤانێت کورد ژبەربون نەخاسما یێت مەلایێ جزیری و فەقیێ تەیران و ئەحمەد نالبەندی .

دەست دنیڤسینا هوزانێدا هەبو ، گەلەك هەلبەست ڤەهاندینە سالا 1975 لگوندێ «بەهنونە» لدەڤەرا گولییا من چاڤ پێکەفتن . چەند هەلبەستەك ژهەلبەستێت وی من لدەڤ خونڤیسین . ئەڤ هوزانڤانێ ملی ناڤێ وی «حاجی صادق»ە لسەر هوزانێت خو ناڤی خو دنڤیسیت «حاجی بهنونە» . تەمەنێ وی نێزیکی شیست سالیێ بو . ڤان سالا چویە بەر دلوڤانییا خودێ ئەڤا ژێرێ ئێکە ژهلبەستێت وی لدوی رێچا نالبەندی ڤەهاندیە :

ـو حیلمو زانیار
ـ کەسێ وی بونە کار
ـبون مەلیکو سەردار
ـس بوان قەت ناکت چار

* *

غیرەتو تفاقو نان
ـو میللەتا پاسەبان
ـرسو برس بۆوان نەمان
ـەو سەربەستن بێ گومان

* *

داسو بڤرو هەر ئامیر
بو عالەمێ ئەون خێر
قەتل خون ئو قارو قیر
کەس بوان نابت ئەمیر

* *

هندی ملکێ بێ خودان
دوژمنی دەست لێ نهان
دائم شەرە ئو لێگدان
خێر بو وانا تێنە مان

* *

وەختێ تو هەر بەتالی
دائم فەقیر الحالي
بو رزقێ خو نانالی
سەرخوشی هەر سەکرانی

* *

نان گارسو تەحلەنە
ئەوژی بتەعنو لومەنە
خارنا ئاغێ کادەنە
هەردەم بو وی پالەنە

* *

رابە سەرخو جارەکێ
بەس پالدە سەر کێلەکێ
شول بکە خو سست نەکێ
دێ بی عەزیزێ خەلکێ

* *

چەند تە بەلاف کر بەلا
وەك رویڤی کەفتێ خەلا

* *

وەتەنێ مە شرینە
شرینە وەك هنگڤینە
مەحبەت وەتەنو دینە
مە وەج ژخەلکێ نینە

* *

ئەگەر مروڤ کەفتە خوار
دوژمن لێ بون صەد هزار
هەر یەك لەقەك لێداو خار
چەرخو فەلەك بون نەیار

* *

وەختێ سپێدە هات و راست
رابە سەر خو بکە خەبات
روژیو نڤێژو صەلات
پاشی دونیا لبەرتە هات

* *

مێرە سەرو مێرێ باش
یێ فەلاحەو دار تراش
بزانە ئەون مەعاش
صەد ئافەرین صەد کەلاش

* *

بەسە بوتە روینشتن
کەس رزقێ تە نادەتن
هەر تە دڤێت مالو ژن
تیرکێ تە هەردەم یێکون

* *

نانی بسەر شوری نەخو
تو زاخەکێ بدە خو
نانێ کەدا خو بخو
چاڤ بکە جیرانێ خو

دزی‌و سوال پیسن زۆر
شەڤ‌و رۆژ گەرهان لدور
عالەم رەڤین چونە ژور
وەك شەیتانێ شینو سۆر

* *

گەر تە دڤێت حالێ خوش
راکە رەزو پەزو مێش
ئەو دێ تە زوو ئینن پێش
لازم ببی چویڤ ڤەکێش

* *

کانێ زەلامێ سەرشور
دمالا خودا چویڤێ کور
هەر پطپطەو پورە پور
کەس نەشێتن ب چتە دور

* *

بێ نزانت چەند کەرە
مەحتلە بێ رهبەرە
هەردەم بێ سەرو بەرە
هەر بەتالە شول بەرە

* *

حاجیو تو شاعری لێ جاروبار
شیعرێ بخۆ نەکە کار
تە نەصەبرە نە قەرار
جار شاعری جار جوتیار

* *

حاجیو خەم گێری دنێ
تو چرا طەبعەت ئاسنێ
بگرە ئاخرەتێ بەردە دنێ
خو حازرکە بو مرنێ

* *

لشەڤ بێریەکێ دیوانا گرتیە ، سوحبەتا سوحبەتێ دکێشیت ، سوحبەت هەمی لسەر کچەکێ‌یە ، وان رۆژا یا خودایە رەڤان لگەل تۆلازەکی .

حاجی‌یێ متە . مانە پێڤە کا ئەو بوڤێ شولێ چ دبێژیت ، نەبێژە هوزانەك پێ ڤەهاندیە
ئینا حاجی دەست هاڤێتێ ئەف هەلبەستە گۆت :

کەچ فروشی کەچ بازارکر
وی خوە لبەختێ خو سیارکر
نامیس بەردا خو بێ عارکر
تویرکێ پارا بو خوە لکارکر
مەشوەرت گەل ژنا خوەکر
دەگەهێ خوازگینیا ڤەکر
هەچیێ هات پێش سمبێل بادان پەرچەم شەکر
وی هزرەکا مەزن ژخوە کر
وەختێ چو پێش نەختێ مەزن ئاشکرا کر
بابێ کەچی خو پالداڤە خوکەیف خوش کر
دەیکا کەچێ شەراب گێرا شیرو شەکر
خەفکا حیلێ شنویکا ڤەکر

وەختێ تەیر گۆت نەخت زێدەکر
لاوك رابو نەمال ئاڤا نە خاترکر
هەچیێ هات پێش زێدە تر کر
هەتا گەهەشتە هزارا
ژغەیری خەلات‌و سەر بارا
کەچ روینشتە بەر دیوارا
رهوندك ژچهڤا هاتن خوارە
دەست‌و تل دان بن گوهارا
چهەڤ گێراندن دوست‌و یارا
کەچ مەجبوربو رابو سەرخو
کلچیڤێ رەش دا چاڤێت خو
چەند جلێت پال کرن بەر خو
صۆرو سپیاڤ دان رییێ خو
ئیشارەت‌دا مەحبوبێ خو
دەست ددەستی بر دگەل خو
کەچکێ حاکم کر بابێ خو
نەختەك سڤككر مەهرا خو
بابێ کەچێ دەستێت خودان کێلەکا خو
هەر پطپطی دگەل ژنا خو
کەچ بو نەما ئاخرەت ژێ چو



# پەنجە مژین لای منداڵ

جلال خەلەف ژالەیی

●

ڕابەری پەروەردەیی لە سولەیمانی

سانەوی سیروان

●

زاناکان دەڵێن هەندێك لە منداڵان پێش ئەوەی لە دایك بن دەست دەکەنە پەنجە مژین ، بەڵگەش بۆ ئەمە ئەو نیشانانەیە کە بەسەر پەنجە کەڵەی منداڵەوە بەدی دەکرێت دوای لە دایك بوونی . بەڵام زۆرترین منداڵ لە تەمەنی سێ مانگی ، یان چوار مانگییەوە دەست بەم خووە خراپە دەکەن . زۆر لە منداڵان لە تەمەنی شەش مانگیدا وازی لێ دەهێنێت بەڵام لە تەمەنی حەوت مانگیدا زۆربەیان بە گەرمی دەگەڕێنەوە سەری ، تا دەگەنە ئەو پەڕ تەمەنی پەنجە مژین ، ئەویش (18) هەژدە مانگییە .

ئەمجا ئەی دایکی بەڕێز :

دەبێت ئەوە بزانیت کە منداڵی پەنجە مژ ، گریان و کروزانەوەی کەمە ، دانەکانی ئاسانتر دەردێت لە چاو منداڵانی هاوتەمەنی خۆیدا . مانای وایە پەنجە مژین هەر وەکو چۆن زیانی هەیە ئاوەهاش قانزاجی هەیە .

**هۆکانی پەنجە مژین لای منداڵ**

1 ـ منداڵی ساوای پەنجەمژ [پاڵ نەری] مژینی بە هێزو تەواناترە لە منداڵانی تری .

ئەمیش لەبەر ئەوەیە منداڵان جیاوازییان هەیە لەم پاڵ نەرەدا ، منداڵی واهەیە ، ژەمێکی مژینی (20) دەقیقە زیاتر دەخایەنێت و دوای ئەوەش هێشتا پەنجەی دەمژێت . بەڵام هەندە منداڵێکیش ژەمێکی مژینی (5) دەقیقە .. ناخایانێت ، لە گەڵ ئەمەشدا نابینێت پەنجە بەرزەکاتەوە بۆ دەمی .

2 ـ جاری واهەیە کە منداڵ پەنجەکانی دەمژێت دوای تێر بوونیشی لەبەر ئەوەیە کە کونی گۆی مەمکی دایکی ، یان مەمکە شووشەکەی گەورەیەو زۆر شیری لێ دێتە



خوارەوە ، منداڵەکە زوو تێر دەبێت بەبێ ئەوەی لێـوی ماندووبکات ووزەیەك کارکات ، لە دوایی‌دا زۆری پێ‌دێت کە پەنجـەکانی بمـژێت بۆ ئـەوەی کە تـەسکینی خۆی بشکێنێت‌و پاڵ نەری مژینی تێرکات .

3 ـ هەندێ جار منداڵ لە برساو کەم خۆراکیدا پەنجـەکانی دەمژێت .

4 ـ زۆر جـار منداڵ لە تـەمەنی [8 ـ 21] مـانگی پەنجـەی دەمژێت بۆ ئەوەی وەکو ووتمان لە پێشەوە دانەکانی بە ئاسانتر دەردێت .

5 ـ جاری واهەیە کەم نوستنی‌و ماندوبون دەبنە هۆی پەنجە مژین لای منداڵ .

6 ـ ئەگەر دایك‌و باوك ووریا نەبن ئەو منداڵەیان کە لە مەمك دەبڕنەوە نەی خەلافێنن‌و مرۆشی بە باری چالاکی‌یەوە ؛ ئەوە فێری پەنجە مژین دەبێت .

7 ـ جاری واهەیە ئەو منداڵەی کە پەنجەی دەمـژێت تووشی یەکێك لەم گیروگرفتانە بووە :

أ ـ بەربەستێك هەیە لە ناو خێـزانداو نـایەڵێت بگـاتە ئارەزووەکانی .

ب ـ سـەربـەستی تـەواوی نی‌یـە لە یـاری کـردن‌و جموجوڵداو زۆر سەر زەنشت دەکرێت .

جـ ـ هەست دەکات کە لە خۆی خۆشەویستر هەیە لە ماڵداو بەربەرەکانی لەگەڵ دەکات .

د ـ زۆر شەرمنە ، یان ترسنۆکە .

## زیانەکانی پەنجە مژین

لە ڕاستیدا پەنجە مژین لای منداڵێکی ساوا کە تەمەنی لە دوو ساڵ کەمتربێت هیچ زیانێکی ئەوتۆی نی‌یە بەڵام ئەگـەر هات‌و لەو تەمەنە تێ‌پـەڕی‌و هەر بـەر دەوام بوو لە سـەری بەکارێکی سروشتی‌و تەندروستی دانانرێت . ئەو زانایانەی کە لەم باسە دواون دەبنە سێ بەشەوە

1 ـ دان سازەکان

2 ـ پزشکەکانی منداڵ

3 ـ پزیشکەکانی دەروون ناسی

1 ـ دان سازەکان دەڵێن : ئەگەر منداڵ بەردەوام بێت لە سەر پەنجە مژین کار دەکاتە سەر دانەکانی‌و کلۆری دەکات‌و بە نارێکی دەرسکێت .
زیـانێکی زۆریشی هەیـە بۆ پـووکی‌و تووشی هـەوکردنی دەکات .

2 ـ بەڵام پزیشکەکانی منداڵ دەڵێن پەنجە مژین هیچ زیانێکی بۆ نیە منداڵ ئەگەر وازی لێ بهێنێت پێش ئەوەی دانەکانی شیری بگۆڕێت بە دانی تری ، بە تایبەتی ئەگەر منداڵەکە تەندروستی باش بێت .

3 ـ بەڵام دەروون زانەکان دەڵێن : پەنجە مژین دەرگایەکە بۆ بەرەلاکردنی ئەو غەم‌و خەفەتەی کە بەستانویێتی‌یە دڵی‌و بۆتە هۆی دروست‌بوونی بشێوێنی‌یەکی دەروونی وەکـو گەورەیەك وایە لەبەر هـۆیەکی دەروونی دەست بـداتە جگەرەکێشان ، یان تەزبێحەکەی بەتوورەیی‌یەوە بادات‌و هەڵەقوی پێ بکات .

## چارە سەرەکانی پەنجە مژین

1 ـ ئەگەر منداڵەکەت ساوابوو ، چـەند پێـویستی بە شـیر هەیە ، ئەوەندە پێویستی بە مژین هەیە ، وازی لێ‌بهێنە با

بۆ ماوەیەکی زۆر مەمك بمژێت .

- ئەگەر بەشیری قوتو بەخێوی دەکەیت ، یا کونی گۆی مەمکە شووشەکەی زۆر بچووك بێت بە زەحمەت شیری لێ بێتە خوارەوە .

- ئەگەر منداڵەکەت لە یەك سالان بەرەو ژوورتربوو ، وە هەر بەردەوام بوو لەسەر پەنجە مژین ، وازی لێ بێنە مەیکە بە کەلکەزی مێشکت ، هەرەشەی لێ مەکە مەیترسێنە ، یان کەلەبچەی مەکەو ، دەستی مەبەستەرەوە یان پەنجەکانی بە مادەی تاڵ ، یان توون ، یان بۆگەن چەور مەکە .

ئەگەر ئەوکارانە بکەیت مەعنای وایە زیاتر پاڵ بە منداڵەکەتەوە دەنێیت سووربێ لەسەر پەنجە مژین ، لەبەر ئەوەی منداڵ مانگرە .

ئەوەیش بزانە لە 90٪ منداڵی پەنجە مژدووای تەمەنی دوو ساڵی وازی لێ دەهێنن .

4 - سەرکەوتووترین رێگە بۆ وازهێنانی منداڵی تەمەن [2—5] ساڵ ئەوەیە کە خەریکی بکەیت بە یاری کردنەوەو سەربەستی تەواوی بدەیتێ لە جموجووڵ کردندا ، لە پاسکیل لێ خوریندا ، لە تەماشاکردنی تەلەفزیۆندا .

5 - ئەگەر منداڵ گەیشتە تەمەنی پێنج ساڵانیو وازی لێ نەهێنا ، دەبێت هەر چارەی بۆ بدۆزرێتەوەو نابێت پشت گوێ بخرێت .

یەکێك لەو چارانەیش لای دانسازە ، ئەویش ئەوەیە کە چەند کۆ ئەندامێکی تایبەتی بۆ دروست دەکات .

دووەم چارە لە لای پزیشکی پسپۆری منداڵانە . سێیەم : ئەگەر هەر چاری نەبوو دەبێت راوێژو ئامۆژگاری لە پزیشکێکی دەروون زان وەربگیرێت

سەرچاوەکان

1 - طفلك حتى الخامسة . تاليف : سنية النقاش عثمان ط 3 1979 الناشر دار العلم للملايين ص 86 — 89 .
2 - موسوعة العناية بالطفل . تاليف الدكتورة بنجيامين سبوك ترجمة مجموعة من الدكاترة الى اللغة العربية الناشر / المؤسسة العربية للدراسات والنشر ص 226 — 232 .
3 - مجلة طبيبك العدد 119 تموز 1966 60 — 63 .

# چۆن منداڵ سزا ئەدرێ ؟

● بنیامین یوخنا دانیال ●

زۆر دایكو باوك لەو بڕوایەدان کە مەبەست لە (سزا) سزای لەشیە ( سزای جەستەیی body punesh mint ) ، بەلام هەر ئەوەیە کە منداڵ دووچاری هەڵە ئەکات ... چونکە لێدانی منداڵ هەڵەیەکی گەورەیەو جۆرەها ئەنجامی سلبی negative results وەدەست دێنێتو دەبێتە هۆی وونکردنی نرخی پەروەردەیی سزادان ( educational value ) ئەی کەوابێ منداڵ دەبێ چۆن سزا بدرێو کەی دەبێ سزا بدرێ ؟ . یا ....

ئەو راسپاردانە چین کە پێویستە پەیرەو بکرێن ؟ .

**گرنگترین ئەو راسپاردانەی کە بۆ دایكو باوك ئاراستە ئەکرێن ئەمانەن :**

1 — زۆربەی پسپۆرو specialists دەروون ناسەکان ئەڵێن ، پێویستە پاش ماوەیەکی زۆر کورت لە روودانی هەڵە کە منداڵ سزا بدرێ کاردانەوەی ( رد فعل reaction ) هەڵەکەی لێ ببینرێ .



هـۆی ئەمـەش بە پێی بیـرو بۆچـوونی ئەم پسپـۆڕو دەروون ناسە psycholoqists ئەگەڕێتەوە بۆ ئـەو جیاوازیـەی لە نێوان چمکی کات ( مفهوم الوقت time conception )
لە لایەن ئێمەو چمکی کات لە لایەن منداڵەوە هەیە (1) .
2 – نـابێ بە هیـچ شێوەیـەك تـاوانێکی کـۆن ( هـەڵەیـەکی رابوردوو ) بە بیری منداڵەکە بهێنینەوە ، چونکە ئەمە واڵە منداڵەکە ئەکا بەم سێ قۆناغەی خوارەوە داتێپەڕێنێ :
یەکەم : قۆناغی هەست بە ئێش‌کردن ( pain stage ) دووەم : قـوناغی بێـزاربوون ( anncy anoe staqe ) جـا سەرچـاوەی ئەم بێزاری‌یە دایك‌بێ یان باوك یان هەر ئەنرامێك لە ئەندامەکانی خێزانی منداڵەکە . سێیەم قۆناغی گوێ‌نەدان بە دووبارەکردنی سزاکەو سەر چاوەکەی .
3 – پێویستە سزاکە زۆر توند نەبێ ، تا منداڵەکە هـەست بە چەوساندنەوە نەکات ( persecution ) . **دەربارەی رێگاکانی سزادانی منداڵ ، پەسندترین‌و راسترینیان ئەمانەن : ـ**
یەکەم : دوورخستنەوەی منداڵ لە هاوڕێو هاوەڵەکانی‌و بێ بەری‌کردنی ( deprival ) لە یـاری کردن لە گـەڵیانـدا ، هەندێ جار وەك سزایەکی بەکەڵك لە قەڵەم ئەدرێ ، بەڵام پێویستە ئەم سزایە کەم بـەکار بهێنـرێ‌و لەکاتی بـەکار هێنانی‌دا پێویستە بخرێتە نێو چوار چێوەیەکی کاتی‌یەوە ( time frame ) و ماوەیەکی کاتی‌ی ( time period ) دیاری‌کراوی بۆ تەرخان بکرێ ، چونکە ئـەو کاتـەی منداڵەکـە لەگەڵ دۆست‌و هاوەڵەکانی یاری ئەکات‌و هامـوو شۆیـان لەگەڵ ئەکات ، هەولێکی بێ شومار ئەدات بۆ ئەوەی زاڵ‌بێ بەسەر کەم‌و کوڕیەکانیدا‌و هاوڕێو هاوەڵەکانی ڕازی بکات .
زانای دەروون ناس سلاڤسون ( slavson ) دەربـارەی ئەم باسە ئەڵێ : بەڕێگەی یاری‌کردن‌و هامو شۆکردن منداڵ بۆی هەیە هەناسە بدات‌و کەم‌و کوڕی‌یەکانی ( detects ) خـۆی دەربخـات . هەروەهـا یـاری کـردن لە لایـەن منـداڵەوە تامەزرۆی ئەکا بۆ ئەوەی منداڵ بە هۆیەوە گیرو گرفتەکانی ( problems ) خـۆی ڕوو پـۆش بکـات ، یـان بـۆ ئـەوەی خـۆشگوزەرانی‌و تـاسەو ئـارەزووەکانی ( desires ) خـۆی مسۆگەر بکات (2) . لێرەدا ئەوەی لەسەر دایکان‌و باوکان پێویست‌بێ ئەوەیـە کە شـوێنی بەیـەك گەیشتن‌و یـەکتر بینینی منداڵەکانیان بدۆزنەوە ، بۆ ئەوەی تیایدا هەست بە

ئـارامو گوشـادی بکەن . هـەندێ جـار باوکـانو دایکان ئارەزووی ئەوەیان نابێ کە منداڵەکانیان بەو منداڵانە بگەن کـە لە گەڕەکدا هـەنو ، خـاوەنی خـوو ڕەوشتی قبـول نەکراون ( habits ) ، بۆ ئەوەی ئەم خوو ڕەوشتانە بە هۆی یـاریکردنو بـەیەک گـەیشتنـەوە نـەگـوێـزرێنـەوە بـۆ منداڵەکانیان .

ڕێگە بدەن منداڵەکانیانو هاوەڵەکانیان لە ماڵەوە یاری بکەن ، بۆ ئەوەی خۆیان سەرپەرشتیان ( supervise ) بکەنو چاودێرییان بکەن ، هەروەها یارمەتیان بدەن بۆ ئـەوەی دەستیان بگـاتە ترۆپکی بەهرەو ئاواتو ئەو ڕێرەوەی کە لە ژیانیاندا بـووە بە مەبەست (3) .

دووەم : هەندێ جار ، پاش ئەوەی منداڵ هەڵەیەک ئەکا ، هەست بە جۆرە پەشیمانیەک ئەکات ( repent ) . واتە ئەتـوانین بڵێین خۆی سزائەدات : سزای دایکو باوک لێرەدا بـە چەنـد جارەکردنی ( مضاعفة duplication ) ئـەم هەستـە ئەبێ . بـۆ نموونە : **کچۆلەیەک کە بووکە شووشەکەی ئەشکێنێ ، ئەم جۆرە ڕستانەی بۆ ئاراستە ئەکرێ :**

- ئەوە بۆ بووکە شووشە جوانەکەت شکاند ... ؟ تەماشای کە چۆن ئەگری ...

- تەماشاکە بووکە شووشەکەی خوشکت هێشتا هەرماوە ، ئەو لە تۆ ژیرترە ...

لێرەدا دەبێ ئەوەش فەرامۆش نـەکەین کـەوا زۆربەی ئـەو منداڵانەی کە پاش کردنی هەڵەیەک هەست بە پەشیمانی ئەکەن خاوەن کەسایەتیەکی هەستیارن ( sensitive personality ) لەبەر ئەوە پێویستە مامەلەیەکی تایبەتیان لە گەڵا بکرێت سێیەم : بێ بـەری کـردنی مـنـداڵ ( deprivation ) لە خـۆشی یـەکی دیاریکراو .

دایکی زیرەک لێرەدا ئەو دایکەیە کە لە توانایـدا دەبێ چەشنە بێ بەریەک بدۆزێتەوە کە ئەو ئەنجامـەی دەمانـەوێ وەدەست بێنێت بۆ نموونە کە منداڵێک لەکاتی نان خواردنا بەد خوویی پیشان ئەدات ( شەڕکردن ، قسەی ناشیرینکـردن ، جنێودان ، هاوارکردن ... ) ، سزاکـەی بەوە دەبێ داوای لێ بکرێ بەشداریان نەکات لە نان خواردناو بە تەنیا نانی خۆی بخوات . بەمە منداڵەکە ئەتوانێ بە ئاسانی لە ڕاستی بگاتو ڕەشو سپی لەیەک جیا بکاتەوە . واتە پێویستە پەیـوەندیـەک ( relationship ) هەبێت لە نێوان جۆری سزاکەو ئەو هەڵەیەدا کە منداڵەکە دەیکا .

**چەند ڕێگایەکی تـر بۆ چـاک کردنی repair خـوو ڕەوشتی منداڵ :**

**یەکەم تێرکردن** ( station ) :

مەبەست لە تێرکردن ، لابردنی هەموو جۆرە بێبەرییەکە کە لە منداڵدا دەبینرێ .

**دووەم : پشتگرتن** ( reinforcement ) .

مەبەست لە پشتگرتن ، هان دانی منداڵە بۆ بەردەوام بوون لەسەر ئەو خوو ڕەوشتە نوێیانەی کە پێچەوانەی خوو ڕەوشتە قبوڵ نەکراوەکەن (هەڵە) .

**ئەمەش چەند هۆو کارێک کاری تێ ئەکەن :**

1 — **جۆری پشتگرتنەکە .**
2 — قەبارەی پشتگرتنەکە .
3 — ئەو ماوە کـاتییەی ( timeperiod ) کـە منداڵەکـە تیایـدا لە پشتگرتن بێ بەری کراوە .
4 — ئەو ماو کاتییەی کە ئەکەوێتە نێوان پشت گرتنو ڕوودانی هەڵەکەوە .

سێیەم : کوژاندنەوە ( extinction )

مەبەست لە کوژاندنەوە گوێنەدانە بـەو خوو ڕەوشتـە قبول نەکراوەی کە منداڵ ئەیکا بۆ ئەوەی سەرنجی دایکو بـاوکی رابکێشێ .

**پەراوێزەکان :**

1 — سزادانی منداڵ ، بنیامین یوخنا دانیال . ڕۆشنبیری نوێ . ژ . 80 — 1980
2 — بروانە منداڵو دۆستایەتی ، بنیامین یوخنا دانیال . بەیان ژ ـ 51 تشرینی یەکەم 1978 .
3 — منداڵو یاری کردن ، بنیامین یوخنا دانیال . ل 4—6 ، چاپی یەکەم بەغداد 1978

# بۆچێت هێشتم ؟

*جلال حمدامین*
کۆیە
1983/5/17

لەگەڵ کۆچت
خەزان هاتو گەڵا سەوزە گەشەکانی بەهاری دڵ ، کەوتنە وەرین.
مەلەکانی هیـوای ژینم ، بەرەو ئـاسمانێکی دوور لە هـۆشم، کەوتنە فرین.
هیچ شەونی یە،
دەیان تەرمی حەزەکانمی تیا نەنێژم
شەوگار نەبوو،
یادەکانت خولیای نەبێ سەری گێژم
گەر بمەوێ،
تەنیا ساتێك لەیادت کەم
دەبێ چرکەی دلی سڕبووم ئا لەو ساتەدا ڕاگرم چۆن ئەتوانم لە «ژیان» بمو
یادگاری پڕ برینم فەرامۆش کەم
ئای شیرین گیان نازانم بۆ ... بۆچ نامرم
چەندحەز ئەکەم،
کە بتوانم ڕازەکانی ناو دەروونمت بۆ بنێرم بەلام چبکەم ،
پێویست ئەکات هەموو هەگبەو توێشە بەرەی،
ناو جیهانت بۆ داگرم
تەنیا ڕازێك، لام پەنهانە ..
لەسەر ڕێگای دووری کۆچت کە دانیشتم
چاوەکانم کەوتنە پرسیار لە نیگاکەت
ئازیزەکەم زوو پێم بلێ ،
بۆ جێت هێشتم؛ بۆ جێت هێشتم.. ؟




● سامان عبدالقادر دزەیی ●

«پیشکەشە بە ئەنوەر قادر محەمەد»
لەبەر تۆ بوو
دەرگام لە زریان کردەوە
ڕەزی دەروونی خۆم سووتاند
چراکانم خامۆشی کردن
دەنگی ئاوازی خۆم خنکاند
وەك شێت بەسەر
کێوی گەیشتنت کەوتم
هەروەك کەشتی یەکی وونبوو
گەرداوی سەخت ڕای فڕاندم
سەدان جار کڕنۆشم بردو
جارێ لەلات نە درکاندم
بۆ وەك دلداری دلتداو
دوایش سەرت لێ شێواندم

* * *

لەبەر تۆ بوو
ڕۆژی بەرزی ئاسمانی من
دەییەستو دەبوو بە سەهۆڵ
خوێنی ناو لەشم دەمەیی و ...
هەلیش دەچوو .
هەرچی شیعر بوو دەسووتا
هەر دووکەلی شیعرەکان بوو
دەبوو بە سروەی بەیانی و
خۆی دەنووساند بەسەر ڕووتا
هەرچی کەژبوو لە ڕێگەتا
هەموویم ڕوخاندو دەرکرد
ئەوەی نەدەکرا بۆتۆم کرد
کەچی لەلات نەدرکاندم
«لێت دلگیر نیم ، خۆم بەخۆم کرد»[1]

(1) لە شیعرێکی ئەنوەر قادر وەرگیراوە

# دوو نامەی زۆر کورت

عومەر فارس محەمەد
کفری

(1)

نیشتمانم ...
ئەگەر رۆژێ
پێویستت بە گیانی من بوو
پێم نەبەخشیت
یاخوا لەشم دابرزێت و
دەرچێ گیانم !
گەر شەوێکیش
کاروانی مان و نەمانت کەوتە رێگا ،
پێویستی بە دوو مۆم هەبوو
چاوی خۆمم بۆت نەسووتان
لەبینینی دونیای رۆشن بێبەری بم
یاخوا کوێربن چاوەکانم !

(2)

خۆشەویستم
خۆشەویستیت
نیشتمانی هەورەکانەو
منیش هەڵۆی شیعرم وەك هەور
بەرز ئەفرم
وا رێگایەکی سەخت ئەبڕم
بۆلات هاتم
تا ئیلهامی شیعرێکی نوێم پێ ببەخشیو
ماچێ بکەی بە خەلاتم !

# یەکەم هۆرەی خۆشەویستی

● نەوزاد علی ●

هۆ کچێ نازە
خۆشم دەوێ ی بێ ئەندازە
گوڵی ئاواتی بەهارم
هەرتۆی نیازە
پاداشتەکەم بۆ نیگاکەت
پڕ لە رازە ...!

من کۆست کەوتەی
بالاو دلتم
چاوەڕێی رۆژی سەرکەلتم
باش بزانە
هەست و نەستم
هەر بۆتۆی شۆخ ،
دەخەمە سەر بەری دەستم

هۆکچێ نازە
داماوێکم ، رێگام سەختەو
گەلێ تەنگە
دلدارێکم
گەر وەفاکەت نەدرکێنی
مانم نەنگە !

هۆکچێ نازە
نازانم بۆ
من ئەوەندم تۆ خۆش دەوێ
کەحێلی نێو گوڕەپانم
هەرتۆی دەوێ
ئایا دەبێت لەم گرەوە
تۆم بەرکەوێ ؟!

هۆکچێ نازە

# پەپولە

قەهار کەردی - هەولێر

تا ئەو دەمەی خۆر هەڵدێ
رۆشن دەبێ شارو دێ
پەپولە بەبێ باکی
دەسووتێ بۆ رووناکی
لە هەزمەت شەوی تاریك
دەبڕی رێی دوورو باریك

لە دوورترین شیوو چۆم
دێ بەرەو مەشخەلی مۆم
تا گڕ بەردا لە گیانی
رۆشن کا رێی نەزانی
دەسوتێنی پەڕو باڵ
لە رێگای پڕ قۆرت و چاڵ

منداڵیش ئەبێ وابێ
بۆ نیشتمانی چابێ
بۆ نەختێ تیشك و گەزەنگ
بسووتێ لە شەوە زەنگ
بۆ گەڵ و خاکی بابی
دەبێ لەمپەو چرابی

رفعت عمر پیربال
نیسانی 1983
هەولێر

# حەزێکی گچکەی تۆ ..

کە ئێواران
یادت دەکەم ،
وەك زەردە بەی بەر شەپۆلێ
هەناسەی ساردی ڕێبەندان ،
بۆت دەلەرزم ...
خەمەکانم
لەگەڵ حەزە سوورەکانت
سەما دەکەن ،
جا گڕ دەگرن وێنەی قەقنەس
باڵ دەگرن و .
دەبنە دەروێشێکی بێکەس ...
باڵ دەگرن و
دەبنە پەڵە هەورێکی سوور
بەجێم دێڵن و کۆچ دەکەن
بەرەو سنوور ...

* * *

کە زریانی تۆیش هەڵ دەچێ
ڕووەو ئاسمانی من دەچێ
هەوری خەم و حەزەکانم
لەگەڵ بای دڵڕەقی ی تۆدا
دەست لەقژی یەکتر دەنێن ...
خوێنی دڵی شیعرەکانم
دڵۆپ دڵۆپ ،
فرمێسکی زامی هۆنراوەم
تنۆك تنۆك ،
بۆ دۆزەخی تۆ ، مل دەنێن ...

* * *

خەمەکانم
بە وێنەی تۆی شۆخ، ناسکن
ژان دەگرن و
سکیش دەکەن
هەزارەها بێچووە خەمی ناسك ناسك
وەکو ڕەوەی جوانی ئاسك
دەبارێنن ...
ئەستێرەن و
لە شەوانی ئەوینی من دەجریوێنن ...
پۆلە کەون
لە کوێستانی سەنگەری عیشقم دەخوێنن ...

* * *

ئەوسا منیش ،
خەمەکانم دەسووتێنم ...
ژانەکانی ئەم جەستەیەش
دەکەم بە چەپکێ هۆنراوە
بۆ تۆی دێنم ...
خۆڵە مێشی
وڵداری ی سووتێنراویشم
بۆنی ئاواتێکی نوێ ، گەش ،
خۆزگەی ڕەنگاو ڕەنگی کۆرپەی شیرە خۆرەی
گشت شۆخێکی ڕەش پۆشی ، ئەم
شارۆچکە هەراج کراوە ،
دەگرێتە خۆی ...

کورتە چیرۆک




● مدیحة صابر صوفي ●

لەنێو غەڵبە غەڵبی کارەساتێکی بێ ئەنجامی چاوەڕێ نەکراو هاتبوّوە ، بە هەناسە بڕکێو بە دەستی بەتاڵو بە حەپەساوی ، ئاراستەی چاوی تیژڕەو بوو ، لە ڕێچکە وون بووەکان ئەگەڕا ، ئەبوایە خۆی بتەکاندبایە لە تەپ و تۆزی سەر پەرێزی ئەو ساڵە ، لە ماندووبوونی بێ بەری ئەو ساڵە ، بەڵام هەرچەندی ئەکرد ئەو تەپو تۆزەی لا زۆر بەنرخ بوو ، تاوتاو بۆنی ئەکردو تاوتاویش لێی ئەسڵەمیەوە ، ڕووی کردە دەشتە نیمچە زەرد هەڵگەڕاوەکە ، لە شوێنێکی نیمچە شاخاویدا لەژێر ئاسمانێکی تاوتاو ساماڵو پەڵە هەوردا ، بە دەروونێکی ڕوو لە ڕوخانەوە دەقی گرتبوو چاوی بڕیبووە دوا خاڵی ئاسۆ ، هەر چەند تێ ڕا ئەما هیچ تروسکاییەکی بەدی نە ئەکرد ، لە ئاستی بەراوردی کۆشکی خەیاڵو کەلاوەی ئێستایدا ، بەهار پایزێکی بە شوومبوو ، وردە وردە ئەچووە ناخی خۆیەوە زیاتر خەمی داڵدە تاقانە لەدەست چووەکەی ، ماندووبوونی دروێنە بێبەرەکەی ئەیخستە گێژاوێکی سەیرەوەو لەبەر خۆیەوە ئەنوزایەوەو وەك چۆن لەگەڵ پەیکەرێکی پیرۆز بدوێ : «خۆمن هەگبەکەی سەرشانم پڕ لە توێشووی ڕێگایەکی درێژخایەن بوو ، خۆ من توێشووەکەم بووە خۆراکی گورگە برسییەکان ، پاڵەوتەی ئارەقەی ڕێگام گوڵدانی سەرمێزی ناحەزی ڕازاندەوە» لە ئاستی واق وڕماوی خۆی سەری هەڵبڕی و چاوی بڕی یە بێ یەك لەبەر خۆیەوە ئەی ووت :

«داری حەزەکان گوپکەیان کردووە ، ئەیەوێ بیدرکێنێ کە دارەو گوپکەکردن بەهارە ... منیش داری حەزم گوپکەی کردبوو ویستی چەکەرە بکات ، بەڵام وا دیارە پایزی هەڵبژاردبوو بۆ وەرزی زەماوەندی ، تومەز پایز خۆی بووکی ڕەشەبایەو لە توێی بەهارا خۆی حەشار داوە .. وەك خاوەن بەهار تەکانمدا لە پایزا نیشتمەوە» .

گوپکەی حەزی «لاوە» سەرە تاتکێیەتی بۆ دەرفەتێکی لەبار ، چرۆکانی ئەمرۆ ... یەك یەك بە هەناسە ساردی زیندە چاڵ ئەکرێن ، ڕەشەبای وەیشومیش نازانێ هەر شوێن چرۆ زیندەچاڵ کراوێ ، فەوتاوێ ، چەندەها چرۆی ئەکاتە مەدالیای سنگی .

لاوە ... ویستەکانی لە ناخیا قوڵپەی دێ ، دەستەو ئەژنۆیی لەلا تاوان بوو بۆیە ڕەشەبا بە باگردێنی دەستی بۆ پینەکردنی کەلاوەکەی «لاوەی» کردە سەرینی خۆی ، بە قەتماغەی ئاسنین دەسرازەی دەستو دەمی کرد ، چاوەکانی هەروەك چاوە ڕاهاتووەکان ڕانەچڵەکێن ، ئەو تیشکی چاوانە کوێرەی زۆری بۆ شاگردە ، ئەو قەتماغە ئاسنینە دەتوێتەوە ، تیشکی چاوی ئەو کوێرانە تیزابە ، «تیزاب ئاسن ئەتوێنێتەوە» هەلاوی قینی ڕەشەبا ڕەت ئەکەنەوە ، «لاوە» هەگبەی سەفەرێکی دووری خستە سەرشان ، توێشووی ڕێگایەکی سەختی ڕاپێچ کردو تیشکی چاوی دروشمی وورە بەرنەدانی کردە وەسیەتنامە بۆ منداڵەکان .

= ڕەشەبا با هەر خەریکی باگردێنی کەلاوەکە بێو چرۆکان لەژێر زەبری باگردێنەکە بهلیشێنێتەوە ... «لاوە» لەم بیرو لێکدانەوەدا بوو ، لەپڕ سروەیەکی فێنك لەلای چەپییەوە هەڵی کردوو لەشە تاساوەکەی بە ئاگا هێنایەوە هەرکە ئاوڕی سەرچاوەی سروەکەی دایەوە ڕوانی لە گۆشەی نێوان دوو بەردی مەرمەڕی قەد پاڵێکا گوڵە نێرگزێکی زەردو گوڵاڵە سوورەیەك باوەشیان بە یەکا کردووە ، دژی ئاراستەی ڕەشەباکەو بزەیەکی وورە بەرزی کردە دیاری چاوی «لاوە» ...

کەرکووك

بەهاری / 1983

نووسینی : مەجید ئاسنگەر

# ئەگەر پارەیە .. ئەگەر پارانە ..

( پەردەی یەکەم )

[ دوکانی حاجی مارف . دوو لاتەختی کۆن لەملاو لەولاوە دانراوون . لە بنەبانی‌یەوە کورسییەکی ئانیشکەدار هەیەو لە بەردەمیەوە میزێك بە پارچە پەرۆکێکی کۆن‌و چلکن داپۆشراوە . لە پشت کورسییەکەوە لە نێو دیوارەکەدا قاسەیەکی کۆنینە دەبینرێ کە هەمیشە داخراوە . لە قوژبنێکی دوکانەکەدا هەندێ شرە گوونیەو داوەبەن بەسەریەکەوە کۆمەڵ کراوون ] .

[ کات چێشتەنگاوێکی رۆژی هەینی‌یە . حاجی مارف لەسەر کورسییە ئانیشکەدارەکەوە دانیشتووە . چاویلکەیەکی تۆزاوی بۆ خوێندنەوە لە چاوکردووە لەوە دەچێ لە دەستی خەلکی کڕیبێتەوە چونکە نە بە رێکی بەسەر لووتییەوە دەچەسپێ‌و نە لەوەیش دەکا بە چاکی بتوانێ بخوێنێتەوە . دەفتەرێکی زلی لە بەردەستایە لەسەر مێزەکەوە ، کورتە قەڵەمێکی بەدەستەوەیە . لەسەر پارچە کاغەزێکدا شت دەنووسێ‌و خەریکی کۆکردنەوەو لێکدان‌و دەرهێنان‌و دابەشکردنە . بە چرچولۆچی دەم‌وچاوو کزی دیدەیا لەوەدەچێ تەمەنی لە بان شەستەوەبێ . کە شیدەیەکی پانی لەسەرایەو کەواو سەڵتەیەکی مەیلەو کۆنی لەبەردایە . کراسەکەی بێ یاخە یەو پشتێنێکی قایشی بەستووە . منالکارێکی رووتەڵە دێتە ژوورەوە ، زەنبیلێکی بەتالی لەبن هەنگڵدایە ] .

**حاجی مارف** : ( بێ ئەوەی سەری هەڵبڕێ ) هەتیو حەمەکە ، ئەوە چیت بەسەرهات ؟ .

**حەمە** : ( بە هەناسە برکێوە ) مام حاجی ، ئاخر هەتا شتەکانم کڕین‌و بردمنەوە ماڵەوەتان ...

**حاجی مارف** : ئێ باشە ، ئەی حاجی ژن هیچی نەگوت ؟

**حەمە** : ( زەنبیلەکە دەخاتە ژێر لاتەختێکەوە ) نەخێر . نەخێر .

**حاجی مارف** : باشە . ئەی کوا باقی پارەکە ؟

**حەمە** : ( قیت دەبێتەوە ) مام حاجی ، شتەکان بای نۆ پەنجایی‌و چل فلووس بوون .

**حاجی مارف** : ( سەیری دەکا ) ئێ منیش نیو دینارم دابوویتێ . ئەی کوا باقی‌یەکەی ؟

**حەمە** : ( بە تێرامانێکەوە ) مام حاجی ، دەفلووس دەمێنێتەوە . فەرموو ئەمەش دەفلووسەکە .

**حاجی مارف** : ( دەس بۆسەر مێزەکە درێژدەکا ) بێنە ، لێرەدا دایێ . ( حەمە دەفلسییەکە دادەنێ‌و بەگرژییەوە دەگەڕێتە دواوە بۆ نزیك دەرگاکەو دادەنیشێ . حاجی مارف دەفلسییەکە هەڵدەگرێتەوەو لەبنی باخەڵیدا زرنگەی لێوەدێ .

رەحمــان دێتە ژوورەوە . پیــاوێکی کەڵەگــەتی ڕەقەڵەی ڕەنگ زەردەو تەمەنی چل و پێنج ساڵێك دەبێ . کورتەك و شەرواڵێکی بۆرکەڵەی پیناوی لەبەردایەو جامانەیەکی ڕیشوەداری بەستووە . لە ڕوخساریدا دیارە وەك لە خۆشیدا بووبێ و لە ناکاودا هــەرچی خەفــەتی ئەم دونیــایە هــەیە نرابێتە سەر سنگییەوە ) .

**ڕەحمان** : سەلامونعەلێکم .

**حــاجی مــارف** : وەعــەلێکــومــولســەلام وەرەحمــەتــوڵلاهی وەبەرەکاتوهو . فەرموو ، فەرموو دانیشە . ( قەڵەم و کاغەزەکە دادەنێت )

**ڕەحمان** : ( لەسەر لاتەختێکیانا دادەنیشێ ) .

**حاجی مارف** : ( جگەرەیەکی زەلی بۆ ڕادەگرێ ) بەخێر هاتیت . فەرموو .

**ڕەحمان** : ( جگەرەکە وەردەگرێ ) خــۆشبیت مام حــاجی . ( جگەرەکە دادەگیرسێنێ و دەکەوێتە مژینییەوە )

**حاجی مارف** : ( چاوێلکەکــەی دادەنێ ) ئێ کاك ڕەحمــان ، چۆنن ؟ چاکن ! ئەوە لە کوێیت دەمێکە دیارنیت ؟

**ڕەحمان** : ( بەکزییەوە ) بەخوا بڵێم چی مام حاجی خــۆیشم نازانم بۆ دیار نیمە .

**حاجی مارف** : ئەی باشە کارو بــارتان چــۆنە ؟ خــۆ شوکــور وەزعتان چاکە !

**ڕەحمان** : ( قومێ ئــەدا لە جگەرەکــەوە بە دووکــەڵەکەیــدا هەڵدەڕوانن ) کارو بار ؟ جا نــاشکوری نــەبێ چ کاروبار هەیە هەتا چۆن بێ و چۆن نەبێ ؟

**جاجی مارف** : ( دەکرژێتەوە ) بۆ کاکە بۆ ؟ خوا نەخــواستە چی بووە ؟

**ڕەحمان** : ( بە ئاخێکەوە ) مامە حاجی ، خۆت دەیزانیت .

**حاجی مارف** : ( تیوەی ڕادەمێنێ ) خۆم ! خۆم چیدەزانم ؟

**ڕەحمان** : ( بەسستییەکەوە ) ئــەدی بڵێم چی ؟ ئاخــر ئەی خۆت نایزانیت حاڵ و بــار چۆنــەو چۆن نییــە ! بێ دەرامەتی و بێ ئیشی و دەستکورتییەو ... ئیتر .

**حاجی مارف** : ( دەگرژێتەوە ) ماڵت بەقوڕ نەگیرێ ، جا هەر لەبەر ئەمەیە وا پەرێشانیت ! داخۆ گوتم خوا نــەخواست چی ڕویــداوە ! حــەمــە ( بــانــگ دەکات ) هەتیو حەمەکە !

**حەمە** : ( بەهەڵەداوان بەرزەپێ دەبێ ) بەڵێ مامە حاجی !

**حاجی مارف** : بڕۆ بڵێ دوو دیشلەمەمان بۆ بێنن . جامێکیش ئاوبێنە .

**حەمە** : بەڵێ . بەڵێ ، هەر ئێستا ( دەچێتە دەرەوە ) .

**حاجی مارف** : ( بەخەندەیەکەوە ) تۆ لەم لایەنەوە هیچ خۆت دڵتەنگ مەکە . هەی لەمنت نەکــەوێ ، ئەدی مامی خۆت چییە ؟

**ڕەحمان** : ( بە ئومێدێکەوە ) ئاخر ...

**حاجی مارف** : ( قسەی پێ دەبڕێ ) جا ئەگەر من بۆ ڕۆژێکی ئاوا نەبم ئەی بۆ کەی ئەبم ؟ نا ، کوڕی خۆم ، نا ... دڵت هیچ نەکات ... ( چایــەچی دوو پیاڵە چای تاڵ و جامە ئاوێ دەهێنێ . ئاوەکە دەداتە حاجی مارف و هەریەکەیان پیاڵە چایەکیان بــۆ دادەنێ . حــاجی ئاو دەخــواتەوەو دەیــداتــە ڕەحمان ، ئەمیش قومێکی لێدەداو چایەچیەکە وەری دەگرێتەوەو دەڕوات ) .

**ڕەحمان** : ( بەدەم دیشلەمــە خواردنــەوەوە ) مام حــاجی ، خۆشم نازانم بڵێم چی ؟

**حاجی مارف** : ( فڕلە دیشلەمەکە دەدات ) من پێت بڵێم . وەکو پاروپێرار ، پارەی خۆت وەرگرەو ناوی خــوای لێبێنە .

**ڕەحمان** : جا ، باشە ، حیسابەکەمان چۆنەو ... چۆن دەبێ ؟

**حاجی مارف** : ( دیشلەمەکە تەواو دەکاو پیاڵەکە دادەنێ . دەفتەرەکە ڕادەکێشێ . چاوێلکەکە دەخاتــەوە سەر لووتیەوە دەکەوێتە هەڵدانەوەی پەڕەکانی دەفتــەرەکــەوە . لە ئــاستی لاپــەڕەیــەکــدا دەوەستێ . دەفتــەرەکــە لە چــاوی نــزیــك دەکــاتــەوەو دووری دەخــاتــەوەو دیســان دەیهێنێتە پێشەوە ) ئــا ئەمــەتە خــۆیەتی .. حیســابی ڕەحمانی حــاجی کەریم .. لاپــەڕە سیانزە .

**ڕحمان** : ( بەترسێکەوە ) دۆزیتەوە ؟ ( لەبەرخۆیەوە )

